شیعر



# بەئەوینت



# ڕابردووم بسڕەوە

ستیڤان شەمزینی



- ناوی کتێب: بە ئەوینت ڕابردووم بسڕەوە
- بابەت: شیعر
- نووسینی: ستیڤان شەمزینی
- دیزاین: هەرێم عوسمان
- چاپ: چاپخانەی کارۆ
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠٢١ – سلێمانی
- نرخ: 3000 دینار

لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٣٢٩) ی ساڵی ٢٠٢١ ی پێدراوە

# لە پرسەی خۆمدا

پرسەکەم زۆرتر لە ئاهەنگێکی خنجیلانە دەچێ

دۆست و دوژمن لە ژێر تابووتی مەرگما کۆدەبنەوە

تارماییەکەم لە پرسەکەدا ئامادەیە

لەو ماتەمگێڕانە ورد دەبێتەوە حزوریان هەیە

زۆر دەموچاوی نامۆ دەبینم

هاوڕێ دێرینەکانم چاو دەکەم

وەك ئەوەی نمایش بکەن

خۆیان خەفەتبار نیشان دەدەن

ناتوانن بزە خۆڕسکەکانیان بشارنەوە

بە تەریقییەوە لە پێش چاوی ئامادەبووان دەڵێن

بیرەوەرییەکی خۆشی رەحمەتیمان بیر هاتەوە!

سیخوڕەکان هەر هەموویان لەوێن

یەکێکیان سەراپا ڕەشی پۆشیوە

یەکێکی تریان شانی لەسەر کێلی گۆڕەکەم داداوە

لە دەموچاوی ماتەمگێڕان ورد دەبنەوە

هاتوون تا دڵنیابنەوە لە مردنم
دڵتەنگیشن بۆ خۆیان
ئەو پارووە چەورەیان لە کیس چوو
دەیانگوشییە چەلاوی راپۆرتە رەشەکانیانەوە
بۆ کۆشکی سوڵتانی خوێن و خیانەتیان دەنارد
هەندێ لە هاوڕێ نووسەرەکانم لەوێن
چاویان لەسەر ژنانە
نازانن لای کێی تر ناوم بزڕێنن!
سەرژمێری ئامادەبووان دەکەن
دڵخۆشن بەو پرسە سارد و چۆڵە
دەنا لە ئیرەییدا دەمردن
ئەوان لە ئەزەلەوە کۆمەڵێك کرمی حەسودن
بەغیلی بە جۆری مردنەکەشم دەبەن
ئەوان لەوێن
تا بزانن چی ژنێکی نەناس لەوێ هەیە
هێشتا ژەهری بوختانیان نەکردۆتە مێشکییەوە
نەیاران لە پێش هەموانەوە ئامادەن
لەژێرەوەڕا تۆمەت بۆ مردنم هەڵدەبەستن و
بە سەرتاسەری شاردا بڵاوی دەکەنەوە
مردنەکەم وەك گزییەکی شەیتان دەبینن

دڵنیان لەوەی بە شۆخییەوە مردووم

زەلکاوی بیرکردنەوەیان پڕە لە گومان

باوەڕ ناکەن من مردبم

پێیانوایە نێردراوم ببمە یاساوڵی گۆڕستان

تا چاودێریی سکونی مردووان بکەم

حیکمەتی بێدەنگیی قەبرستان

بە هەڵەداوان بگەیەنمەوە بارەگای ئەهریمەن

ژنەکان

ئەوانەی لەژێر بارانی شیعرەکانما ئەخوسانەوە

مینا ئەوەی نەیانناسیبم

کەس کەسیان لەوێ نابینم

ئەوانەی شەڕیان بوو

لەسەر بەدەستهێنانی دڵم

لەو بۆنەدا ئاشت بوونەتەوە

وەك دەستە خوشکی ناو حکایەتەکان

تاڵەموویەکیش بەنێوانیاندا ناچێت

ئەمێستا کلاَفەی هزرم ئاڵۆزکاوە

نازانم چ ژنێك لە پرسەکەمدا

بە کوڵ بۆم دەگریێ

مۆمێك بە یادی من هەڵدەکات؟

ئەگەر ژنێکی وا هەیە
بە زووترین کات ئاگادارم بکات
تا دوو دێڕی تر بۆ ئەم تێکستە
زیاد بکەم
ئەگەریش نییە
پرسەکە چۆڵ بکەن
با هەر خۆشم بڵێم
ئەلفاتیحا

٢٠١٩-١٠-٤
نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس
شتاسیۆنی نۆرۆلۆگی

## غەزەلێکی دڵ بریندار

کۆتایی تەمەنم

وەك سەرەتای شیعرێکی درێژ

لە تیانووسێکی ئەسمەردا

دەکەوێتە گاگۆڵکێ

ئەم پایانە نابەدڵە

سەرەتای نەزیفی فرمێسکی ژنێکە

سەرەتای پێکەنینی

گروپێك کەمتیارە

دانیان لە لاشەی ئاسکی وەفا گیرکردووە

شایی و لۆغانی

حەشاماتێك شەمشەمەکوێرەیە

سەرچۆپیان بۆ کوژانەوەی ڕووناکی

شاعیرێك گرتووە

قەدەری من وابوو

هەر دەبوو لەسەر دەستی

ناسکترین ژن

لە ژوانێکی کریستاڵی

لە شارێکی کپدا

هەپروون بە هەپروون بم

لە کتێبی چارەنووسم

ئەوەش نووسرابوو

کۆتاییم تەنیایی و

تەنیاییم جاویدانی بێت

ئیدی چۆن لۆمەی ژنێك بکەم

منی لە نێو پێڵووی چاوی و

لە ناو کەژاوەی رۆحیدا هەڵگرتبوو؟

لە رۆژی یەکەمی ژیانەوە

مەرگێکی تەڵخ چاوەڕێی دەکردم

بە وێستگەی چەندین ژاندا گوزەرم کرد

بەسەر شۆستەی هەزاران مەراقدا هەنگاوم نا

چاوم بۆ هیچ خۆشبەختییەك نەدەگێڕا

تەمای دۆزینەوەی ئەو ژنە بووم

چەندان ساڵ بەر لە ناسینی

ڕووخساریم لە گەشتی خەیاڵ

لە توێی خەونەکانی هەرزەکاریدا بینیبوو

مێشکم ببووە فڵچەی شێوەکارێك

ڕۆژ بە ڕۆژ وێنەی ئەو ژنەی

لە زەینمدا تۆخ دەکردەوە

چ ڕێکەوتێکی سەیر بوو

لە نزیکی کۆتاییدا دۆزیمەوە

چ پەرچوویەك بوو

هەمان پۆشاکی زەردەخەنەی

ناو خەیاڵەکانمی لەبەردابوو

هەمان باڵای بەرزی میهری

ناو خەونە خۆشەکانمی هەبوو

چ سەرنەویشتێکی هۆلیۆدییە

ئەم یەکتر دۆزینەوەیە لە کۆتاییدا

چ دەبوو قەڵەمی چارەنووس

کەمێك زووتر یەکتر دۆزینەوەمانی بنووسیبا؟

پێش ئەوەی بکەومە

خەرەندی چەند جار دڵشکان

بەرلەوەی بەریبمەوە

دۆزەخی درۆی چەند ژنێك

پێش ئەوەی قاچاخچییەکان

دڵم بە تولەڕێیەکانی کۆچدا

لە نیشتمانەوە بپەڕێننەوە مەنفا

بەرلەوەی ببمە کۆڵبەری

بارێك غەمێکی ئێجگار قورس و

بە سنوورەکاندا بیپەڕێنمەوە

چ دەبوو قەدەری دوای دۆزینەوەمان

ئاوها پڕ حەسرەت نەبوایە؟

هیچ نەبا لە پەنا یەکتر بووینایە

لەو ئانەی بورکانی ئارەزووم هەڵدەچوو

هیچ نەبا دەستێکی گۆجم نەبوایە

پێوەندەکانی قاچیم بکردایەتەوە

پێکەوە بەناو باخەکانی حەرامدا

پیاسەمان بکردایە!

خودا بۆ نەیکرد؟

لە کۆتایی هەموو کۆتاییەکاندا

دەستم لەنێو دەستی

گیانم لەناو گیانی

دەم لەنێو دەمیدا بوایە؟

چەند ترسناکە دیمەنی ئەم کۆتاییە

**چەند تراژیدیکە ئەم پایانە**

**چەندیش شاعیرانەیە**

**ئەم ڕۆح دەرچوونەم!**

**٩-١٠-٢٠١٩**

**ئەڵمانیا - گوتەرسلۆ**

ئەمڕۆ ڕۆژێکە لەناو دەفتەری بیرەوەرییەکاندا ون بووم، لە نێو ئەلبومی وێنەکانمدا بۆ پێکەنینێکی دەستکرد دەگەڕێم و بۆم نادۆزرێتەوە. ڕۆژێك پڕ لە کزەی ساردی سروشت و ڕۆحی هەڵوەریوی من. ڕۆژێك نزیکترم لە مەرگ و دوور و دوورتر لە ژیان.

# چەرخی سیسبوونەوە

هەوری نیگەرانی
ئاسمانی ڕوانینی داپۆشیوە
لە هەموو لایەکەوە
گوێم لە دەنگی گریانە
بەسەر تەرمی داهاتوودا
لە کەژەکانی مێژووەوە
لافاوی خوێن ڕووەو
دۆڵەکانی ئێستا ڕێچکەی گرتووە
سەردەمێکە دینامیت
دەخەنە ژێر پێی ئەو خەیاڵانەی
هەگبەیان پڕە لە پێکەنین
بۆ سبەینێ
چاخێکی گڕگرتووە و شایەتین لەسەر
هەزاران ڕۆمای سووتاو
دەیان نیرۆنی سمارتفۆن بەدەست

لە نێو زێرابی ئاودەستەکانی سیاسەتدا
زەمەنێکی نەزۆکە
سروشت تووشی پەرکەم بووە
دارستان ئاگر لەخۆی بەردەدات
زەوی دەیەوێ ئۆزۆن قووت بدات
مرۆڤ لەملاوە
وەك شەیتانێکی قومارچی
بە دیار بردنەوەی مشتێك پارەوە
کوێر و سەرخۆشە
چ سەدەیەکە
مایکرۆفۆن و دوگمە فەرمانڕەوان
دنیا بۆتە کارگەیەکی گەورە
ژەهری دڵنیایی تێدا بەرهەم دەهێنرێ
چاومان لێیە
بنەی مرۆڤایەتی لە بڕانەوەدایە
خەونەکان هێندە پووچ بوونەتەوە
لە خەونی ڕۆبۆتێك زیاتر نین
چ قەڕنێکە
خۆشەویستی خەواڵووە
حەوشەی هەوەس لێوانلێو بووە

لە ژن و پیاوی سۆزانی
چ سەرسوڕهێنەرە
پۆلیسەکانی سیستم
بە دوای ئەو پیاوانەدا دەگەڕێن
چرا لەسەر شەقامەکانی ژیان دادەنێن
بەدوای ئەو ژنانەدا وێڵن
ستیانەکانیان بۆنی مرۆڤی لێدێت
بە دوای مندا عەودالْن
کە دەفتەری شیعرەکانم
پەپولەی خۆشەویستی لێوە هەڵدەفڕێ

٢٠٢٠-١-١٧
ئەڵمانیا - گوتەرسلۆ

یەکەمین شیعرمە، دوای ئەوەی ماوەی ١٠٠ ڕۆژ بوو، یەك دێڕ شیعرم نەنووسیبوو. دەمویست دەست لە نووسینی شیعر هەڵبگرم، چونکە دنیا بە شیعر ناگۆڕێت. دوایی بیرم کردەوە ئایا من دنیا دەگۆڕم؟.بۆیە بڕیارمدا دەستپێبکەمەوە، هیوادارم بتوانم بەردەوامی بە شیعر بدەم، چون تەنیا شیعرە رازیم دەکات، هەرچی تر بنووسم و بیکەم بۆ دەرەوەی خۆمە، ئەوەی بۆ خودی خۆم ماوەتەوە بە دڵنیاییەوە ئەم دێڕانەیە کە من ناویان لێ دەنێم شیعر.

# ونبوون لە تەمدا

ژیان سیخناخە بە ژان

بە کوێربوونەوەی نوور

هەموو شتێك لەنێو تەمی تەکنۆلۆژیادا

ون بووە

ئاو هەمان شلەی جاران نییە

هەوا دەردەدارە

هەناسەی سواربووە بە دوکەڵ

سروشت ناڵەناڵێتی

پێستی بە نینۆکی زومبییەکانی ئابووری

شێوێنراوە

لەبەردەم ئاوێنە زامدارەکاندا

فرمێسکی بێدەنگ دەبارێنێ

باران هەمان ئەو بارانە نییە

لە ئاسمانی هەوراوییەوە

روونیی دەبەخشییە زەوی

ئێستا باران سییەکانی پڕن لە خەردەل

تەژین لەو ڤایرۆسە نازدارانەی

لە تاقیگەکاندا بۆ شەڕی ئایندە

وەك سوپایەکی نهێنی ئامادەکراون

هەموو شتێك تۆزی دڵڕەقی مرۆڤی

لەسەر نیشتووە

دەستەسڕێك شك نابەین

بۆ سڕینەوەی ئاڵتونی خۆشەویستی

کە لەژێر ئەو هەموو غوبارەدا

دەستی کەلەپچە کراوە

کێ شك دەبەن پێوەندی

مەچەکی خۆشەویستی بکاتەوە؟

ئەوانەی بوێرییان هەیە بۆ ئەم کارە

لە ژێر قامچی رۆژگاردان

جگە لە هاوارکردن چیتریان بۆ نەماوەتەوە

کێ هەیە لە شەپۆلی چوارەم یاخی بێت و

ناوی لە لیستی تیرۆردا نەدۆزێتەوە؟

کێ هەیە نەفرەت لەم دڕندەییە بکات

لەشی نەبووبێتە شوێن برینی

کەڵبەی پاسەوانانی ئەم ماشێنەی

بەسەر ڕەوشت و بەهاکاندا دەڕوات و

ئێسك و پروسکیان دەهاڕێت؟

هەموو شتێك لەسەر زەوی

رووخساری راستەقینەی لە دەستداوە

شۆڕشگێڕەکانی دوێنێ

لەسەر پشتی ئەسپی ئازادیی دابەزین

بەردەبارانی رابردووی خۆیان دەکەن

وەك گروپێك چەتەی دێرین

تێر لە ئاوی کانی وڵات دەخۆنەوە و

دواتر سەنگەساری دەکەن

شاعیرە ئەڤیندارەکان

چیتر نابنەوە بە گەڕیدەی وشە

چامەیەکی نوێ نانووسن

بەرامەی خۆشەویستی بڵاوبکاتەوە

ئەوان سەرقاڵن بە خۆیانەوە

بەشێکیان بوونەتە ئەلکهولی

بەشەکەی تریان دەرۆزەکەری بەردەم

جامخانەکانی سێکسفرۆشیی

ئازادیخوازان لە هیچ شوێنێك نەماون

نە لە زیندانە کلاسیکییەکاندا بەندن

نە لە کێوەکاندا خۆیان پەنا داوە

ئەوان ئەمێستا تەوقی مەسرەفگەرایی

لە ملیان کراوە

زمانیان بە شرینقەی دۆلار سڕ بووە

هەموو بەهاکان لەناوچوون

هەروەك چۆن ڕەچەڵەکی مرۆڤ لەناوچوو

ئەم سەرزەوییە چەند قەرەباڵغە

لەبەر حەشاماتی ڕۆبۆت

دەرزی هەڵبدەیت ناگاتە زەوی

چەندێکیش چۆڵەوانییە

بە میکرۆسکۆبیش مرۆڤ نابینیتەوە

لەم زەمەنە بێ بەهایەدا

لەبەر راکەراك بە دوای دراودا

لەبەر ژاوەژاوی سیاسەت

لەبەر قەرەباڵغی شەقامەکانی راگەیاندن

لەبەر ئالودەبوون بە سۆسیال میدیا

کەس کەس گوێی لە نەعرەتەی

شاعیرێکی مەست نییە

ئەو مەستە بە خۆشەویستی

سەرخۆشە بە بەها مرۆییەکان

لە پێڕی ئەو شاعیرانە نییە

گۆرانی بۆ ناوگەڵیان دەڵێن

ئەو خەریکە ئاوا دەبێت

تامەزرۆیە بۆ چەند چرکەیەکیش بێت

گوێی بۆ قەسیدەیەکی رابگرن

ئەو ئەیەوێت پێمان بڵێت

دنیا بە چراوگی خۆشەویستی

رزگاری دەبێت

ئەوەمان لێ دەخوازێت

بە شیعر مێژوومان بنووسینەوە

**مەخابن نە کەس ئاوڕی لیّ دەداتەوە**

**نە دەتوانێت لەو چیا بڵندەی غرور**

**بێتە خوارەوە**

**دواجار ئەو بزر دەبێت**

**هەمان ڕۆژ هەموو شتێك**

**لە نێو تەمی سەردەمی دیجیتاڵدا**

**بۆ ئەبەد ون دەبێت**

**٢٠٢٠-٢-١**

**ئەڵمانیا - بیلەفێڵد**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

**تێبینی: لەوانە نییە ئەم چەند دێڕە بووبێتە شیعر، بۆی هەیە شیعرێك بێت ماناکانی لە داهاتوودا زۆرتر بدرەوشێنەوە، ئەوەی گرنگە لای من گەیاندنی ئەو پەیامەیە بە مرۆڤ لە نێو ئەو دێڕانەدا یاداشت کراون.. بەڵام غەمە گەورەکە ئەوەیە ئایا ئەم مەسجە دەگات؟.**

# چراکان کوێربوونی خۆیان ڕادەگەیەنن

مەلەکردنم لەناو خەیاڵدا بیرچووەتەوە
دەستم بگرە
لە قووڵایی ئەم لیتاوەی دڵەڕاوکێ دەرمبهێنە
چاوەکانم پڕبوون لە حەرفی گومان
دنیا بە تەڵخی دەبینم
نائومێدیی نینۆکی لە مێشکم
گیر کردووە
خۆکوشتن ڕژاوەتە ئەندێشەمەوە
ئاسمانم سەری بە پووشی بێهودەیی گیراوە
تەمەنیشم تیرێکە
چل ساڵ زیاترە لە کەوان دەرچووە
بەرەو ونبوون ڕێ دەبڕێ
خەونێکی سادەم هەبوو
خەونێك لە هەموو وەرزەکاندا

**سەوز سەوز دەچووەوە**

**ئەمێستا ڕەنگی زەردهەڵگەڕاوە**

**بێ هاژوهوژ دەوەرێتە**

**ناو لاپەڕەکانی بیرچوونەوەوە**

**چ وەحشەتناکە ژیان**

**نە بەرگەی ئازارەکانی دەگرین**

**نە دەستمان لە دەستی دەبێتەوە**

**چ وەیشومەیەکە بوون**

**نە لە حیکمەتی خەڵقکردنمان دەگەین**

**نە بە ڕێکەوت لەسەرە ڕێگاش**

**سلاٌوێك لە خۆشنودی دەکەین**

**ئای چەند بێگانەم**

**نە لە ئاهونزولەی خۆم حاڵی دەبم**

**نە لە شکانی لقی شادمانی**

**وای چەند دوورم**

**نە دەگەمەوە ماڵی هێمنیی جاران**

**نە توانای گەیشتنم بە ئاینده هەیە**

**من هەزاران میل دوورم**

**بەم هەنگاوانە سستانە**

**چۆن لەم بیابانەوە دەگەمە**

دەشتە بە پیتەکانی خۆشەویستی؟

بەم لەشە داڕزاوەوە

چۆن لەم تاریکستانەی مەنفاوە

دەگەمەوە بە ماڵی نورانی نیشتمان؟

تازە چیم دەستدەکەوێت لە وجود

کە چراکان کوێربوونی خۆیان رابگەیەنن و

زێیەکان لە تینووێتیدا بخنکێن؟

هەر دەبێت سەرم هەڵبگرم

بەرەو باوەشی رەق و تەقی عەدەم

هەر دەبێت دوا گۆرانی

بۆ رۆژانی بەسەرچووی خۆم بڵێم

هەر دەبێت دەرۆزەی دڵۆپێك هیوا بکەم

تا بتوانم خۆکوژیی پیٚ ئەنجام بدەم

دە تۆ وەرە، ئەم تاریکستانەم

بە قەڵەمی تیشك بسڕەوە

ئەم ئاوسبوونەم بە خۆکوشتن

پڕ پڕ بکە لە عیشوەی ژیان

ئەم ئێوارە تەژی نامۆییەم

بگۆڕە بە سپێدەی خۆناسینەوە

دەزانم توانای ئەوەت هەیە

لەگەڵ خۆتدا بمبەیت و پێکەوە
بەسەر پلیکانەکانی ئەویندا سەربکەوین
مەنفا لەبەردەم پیاوێکی ئاوارەدا
خەجاڵەت بکەیت و
تك تك ئارەقەی شەرمەزاریی بسڕێت
دە تۆ وەرە
لەو کاتەی چراکان کوێر بوون
منیش لەم دووری دوورەوە
هێدی هێدی دەتوێمەوە

٢٠٢٠-٢-٢٣
ئەڵمانیا - بیلەفێڵد
ڕۆژی یەکشەمە

ئەم شیعرە ماوەی مانگێك بوو لە مێشکمدا ژانی لە دایکبوون گرتبووی، بەڵام ئازار و نەخۆشی و ناخۆشی هەمیشە ئەو لە دایکبوونەوەی دوادەخست بۆ ئەمڕۆ. شیعرەکە ڕەنگە لێکدژیی تێدا بێت لە نێوان پووچی و ئومێد بە گۆدۆیەك، بەڵام ئەم پارادۆکسە ڕەنگدانەوەی دۆخی دەروونی ئەم ساتەوەختانەی منە.

## ئەو وشە ئاڵاّنەی نایانخوێنیتەوە

شێوەم دەچێتەوە سەر
ئەو بارانەی نم نم دەبارێتە
نێو سۆمای چاوەکانت
پێدەچێت بێ ئاگا بیت
یان هێشتا پێت کەم بێت
لە توێی ئەو هەموو شیعرەدا
هەڵمگرتوویت و
مزگێنی هاتنی بێ گەڕانەوەت
پێ دەدەم!!
لەوانەیە تا ئێستا
ئەو رازەم نەدرکاندبێت
بێدەنگییەکانت ئاگرن
پەڕە پەڕە دڵم دەسووتێنن
شکاندنی گۆزەی تەمەنناکانم

بەردانەوەمە بۆ ناو

خەزاناویترین پاییز

ئەی ئەو ژنەی بە نهێنی

خۆشم ویستوویت و

لەسەر گاشەبەردی فیزت

بە ئاشکرا هارە دەکەم

ڕەنگە کاتت نەبێت

بە خوێندنەوەی دەستنووسەکانمەوە

خۆت سەرقاڵ بکەیت

کە پڕن لە سەوداسەریی

یان نەپەرژێیتە سەر وڕێنەکانی

ئەو دێوانە پیاوەی

لەوەتی لە دایکبووە

پرچی زەردی پاییز

بە گەڵای خەونی ژوانێك

سەوز سەوز دەکاتەوە

ڕەنگە سەرت سوورما بێت

چۆن لە نووسینەوەی

ئەو هەموو مەراقە شیعرە

ماندوو نابم و

یەك یەك دەیانخەمە سەبەتەی

شەوانی تەنهاییتەوە؟!

ئاخر تۆ هێشتا نازانیت

ئەم دڵە چەند سەر بەگۆبەندە

ئەو شیعرانە چەند تامەزرۆن

ئەم پەرداخی রامووسانەش

چەندێك بەتاڵ

لۆمەت ناکەم

ئەگەر پێتوابێت

گڕووگرتنم بە تۆوە

شەڕفرۆشتنم بە قەدەرت

جۆرێکە لە شێتبوون

بەڵێ لەوانەیە تۆ ڕاست بکەیت

ئەوە شێتی بێت

کە حەز دەکەم چەشنی پەروانە

بە گڕی مۆمی مەمکەکانت

هەڵبکڕوزێم

یان حەز دەکەم شیعرە باڵاپۆشەکان

ڕووت ڕووت بکەمەوە

به شەفاف رازی ئەو دڵە شەقار بووەم

بنووسمەوە

دەزانم بە پیاوێکی بێ شەرمم دەزانی

ئاخر ئەی فریشتە ژن

هەستانی ئەم زریانەی هەست

شەرمی بۆچییە؟

داگیرسانی ئەو مەشخەڵەی ئارەزوو

شەرمی بۆچییە؟

سووتاندنی مەودای دووریی نێوانمان

شەرمی بۆچییە؟

توانەوەمان بەسەر یەکتردا

هەروەك دوو مۆمی عاشقە و ماشقە

شەرمی بۆچییە؟

سەربڕینی کارمامزی شیعر

لە بەرپێی هەتاوە ژنێکدا

شەرمی ناوێت

تۆ تا ئێستاش بەدوای کردنەوەی

کۆدی ئەو شیعرانەوەیت

هەموو ڕۆژێك دەیانێرم

بۆ سندووقە زەمبەقییەكەت

ئەی خانمی ڕوون و ڕۆشنایی

ئەی گوڵدانی تیشك

خۆم و گڤەی شیعرم

خۆم و سۆزی كڵپەسەندووم

خۆم و هەزارەها ئاهوناڵەی بێ ڕەنگ

هاتووین

لە بەردەرگای شەونماویت وەستاوین

هاتووین بۆنی هەتاوی سینگت بكەین

هاتووین بۆ لێو تەڕكردنێك

لە هەردوو جۆگەی مەمكت

هاتووین بۆ خۆ ونكردن

لە ڕێگە پێچاوپێچەكانی پرچتدا

هاتووین پڕ سییەكانمان

نەسیمی موحیبەت هەڵمژین

هاتووین هێشوویەك لەززەت

لە دارمێوی لەشت بكەینەوە

**هاتووین وەك بەرچنەیەك هەنجیری نائومێد**

**توێکڵی ڕەشبینی لەبەرمان داکەنی و**

**بمانکەیتە مرەبای ماچ**

**هاتووین بۆ ناو بانیۆی عەشقت**

**خۆمان لە چڵکی حوزن پاك بکەینەوە**

**هاتووین لە پەنای مێینەیی تۆوە**

**هەوارمان بخەین و**

**ئەبەد نەڕۆینەوە**

**١٠-٣-٢٠٢٠**

**ئەڵمانیا - بیلەفێلد**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

**شتاسیۆنی نۆرۆلۆگی**

**ڕۆژێکــی کزۆڵانەیــە، دنیــا لەبــەردەم هەڕەشــەی ڤیرۆســێکی بۆگــەنی وەك کۆرۆنادایە. بۆنی مەرگ و فرمێسکی ئینسان دەکەم. چەند قورسە ئەو شانۆ تاریکەی ژیان لەو سەردەمەدا کە وا بڕوا دەکرا هیچ شتێك لە دەسەڵاتی مرۆڤ دەرناچێت. هەست بە بێ دەسەڵاتیی و دۆشداماویی ئینسان دەکەم لە بەرامبەر رقی سروشتدا.**

# کڕنووش بردن بۆ ئەو خەونەی
# ژنێك دەهێنێتە سەر ڕێی چارەنووسم

تا ئەو ڕۆژەی دەمرم

سوجدە بۆ ئەو خەونە دەبەم

سپێتیی ژنێکی چۆڕاندە

ڕۆژگاری ڕەشمەوە و

وەك دێوانەیەك

لە گوڵستانی مێینەیی ئەودا

نیشتەجێ بووم

ئێستا، بەدەم هەڵهاتنەوە

لە کۆڵانەکانی دڵەڕاوکێ

پرسیارێك مێشکم دەخوات

ئەم وەرزی دۆزینەوەیە

ناوبنێم چی؟

لەگەڵ خۆم ڕێك ناکەوم لەسەر ناوێك

دەمێك ناوی دەنێم

نووسانی مەرجانی قەدەرێکی قەشەنگ
بە تەوێڵمەوە
دەمێکی تر
بە بێداربوونەوەی بەختی نووستوم
ئاوزەدی دەکەم
لەوەش پەشیمان دەبمەوە
بە یەکەمین پێکی خۆشنوودی و
دوا نەفەس لە سیگاری تەنهایی
ئاودێری دەکەم
تا ئەو ڕۆژەی دەمرم
وێڵی خەونێکی سەرەتای تەمەنم
ژنێك لە توخمی یاسەمین
دەرگای شەیدابوونی لێکردمەوە
لە هەیوانی تامەزرۆییدا
ماچمان گۆڕییەوە
پێکەوە تەواڤ ماڵی شیعرمان کرد و
لەسەر بەردە نوێژی موحیبەت
هەزاران ڕکات
نوێژی لێکئاڵانمان دابەست
لە ژێر ئاسمانێکی هەوراوییدا

**هۆنراوە پەپولەییەکانی هەوەسمان**

**دەنووسییەوە**

**بۆ شەوانی ژوانمان دەخوێندەوە**

**تا ئەو ڕۆژەی دەمرم**

**سوپاسگوزاری خەونێکی دێرینم**

**ژنێکی دوورەدەستی**

**خستە کەژاوەی شیعرەکانمەوە**

**ناوی ئەوی لەسەر دیواری تەمەنم**

**بە قەڵەمێکی پەلکەزێڕینەیی هەڵکۆڵی**

**پێش هەڵفڕینی ڕۆحم**

**لە شارێکی تەزیوی فەنتازییدا**

**هەردووکمانی خزاندە**

**ئامێزی یەکترییەوە**

**بەرلەوەی لە ڕووباری چاوەڕوانیدا**

**بە خنکاویی خۆم بدۆزمەوە**

**کردمی بە ماسییەکی چاوباز**

**لە قووڵاییە هێمنەکەیدا**

**لەو دەمەشەوە من و ئەو**

**خۆمان بە تەنافی چارەنووسی یەکترەوە**

**هەڵواسیوە**

بەرلەوەی ڕێی سەربەرەو خواری
مەرگ بڕم
لە گۆرانییەکی لاڵدا خۆم بکوژم
لێوی ماچی پێ بەخشیم
تا شیعرێکی تەڕ لەسەر سینگی ئەو
بە تۆخی بنووسمەوە
تا ئەو ڕۆژەی دەمرم
چاوەڕوانی خەونێکی دێرینم
ژنێکی بە جێماو لە تیرەی جوانی
دابڕاو لە دوا بەیتی
قەسیدەیەکی خەمۆك
لە بۆتەی ڕوئیا بێتە دەرەوە
پێکێك باراناوی لەززەتم
لەگەڵ فەڕ بکات
موبتەلای ئەو حەزانەم بکات
لە مەملەکەتی شێتیی
یان لە مێرگەکانی ئۆرگازم
سەر دەردەهێننەوە
بە نیانی خۆی داپۆشێت و
بە عەشق ژەهر خواردم بکات

**یان هیچ نەبێت**

**دوای هەزار جار لەم خەونبینینەی من**

**بۆ تاکە جارێك**

**دەستم بگرێ و**

**لە خەونێکی سەوزی خۆیدا جێم بکاتەوە**

**٢٠٢٠-٣-١٥**

**کاتژمێر: ١٧:١٥**

**فرانسیسکۆز هۆسپیتەڵ**

ئەم شیعرە، کەوتۆتە زەمەنی کۆرۆناوە. ڕاستتر وایە بڵێم شیعرێکە بۆ خۆشەویستی لەسەردەمی کۆرۆنادا. ئاخر ئەو ڤیرۆسە ناحاڵییە، نەك هەر جوڵەی ئابووری و بازرگانی وەستاندووە، تەنانەت خەریکە جیهان لە یەکتر دادەبڕێت و پەیوەندیی سۆسیالی مرۆڤەکانی خستۆتە ژێر هەڕەشەوە، تەنیا یەك دەرچەی لەبەردەمدا هێشتۆتە ئەویش پەیوەندیی ئەلیکترۆنییە. هەروەك ئەوەی کۆرۆنا نوێنەر و دەمڕاستی نیو لیبرالیزم و شەپۆلی چوارەم بێت، ڕقی لە پێکەوەبوونی مرۆڤەکانە، ئەوەتا ڕێ لە ژوان و ماچ و ئاوێزانبوون دەگرێت و ڕەنگی خۆشەویستی زیاتر کاڵ دەکاتەوە. هەرچەند بۆ من ملدان بەو کارە مەحاڵە. ئەم شیعرەش لەو ساتەوەختەدا لە دایك بوو، هەرچی سەردێڕی هەواڵە باسی ئەو ڤیرۆسە ڕەزاگرانە دەکات، ئەدی کەنگی خۆشەویستی دەبێتە سەرباس و سەردێڕی گرنگترین هەواڵ بۆ هەمووان؟.

# لەم بیابانە قاقڕەدا
# کانییەکی تامەزرۆی چاوەڕوانم

**لەم دەمەدا**

**دنیا بووەتە کەلاکێکی گەنیو**

**عەشق لە سینەیدا گۆرانی نالێت**

**پەنجەرەکانی خۆشنوودی**

**ژەنگی نەگبەتی گرتوونی**

**چیتر مێژووی ئاو**

**تەڕایی لێ ناچۆڕێت**

**چیدی ئەستێرە سەرخۆشەکان**

**بە شەقامی ئاسماندا پیاسە ناکەن**

**باخەکان لێوی زەردهەڵگەڕاویان**

**بە لێوی هەوەسی چۆمەکانەوە نانێن**

**مرۆڤەکان یەکتر ناناسنەوە**

**مەگەر بە بۆنی یەئسەکانیان**

**ئەو ڕۆژە پرتەقاڵییانەی چاوەڕوانیان بووین**

ببنە عەمباری پێکەنین
یەك یەك بە سێدارەی ئافاتەوە هەڵواسران
ئەو ژوانانەی دەبوو
دەرگا لە چێژ بکەنەوە و
سەربردەی ماچە مەکراوییەکان بنووسنەوە
تۆفانی زەمەنێکی دڵڕەق لوولیدان
ئەو حکایاتانەی بڕیار وابوو
لە بەهاردا و لەژێر ئاسمانی ساماڵدا
بگێڕدرێنەوە
لەم زستانە نوتەکەی ژیاندا هەڵدەلەرزن و
زمانیان گۆ ناکات
پێش درکاندنی تاکە وشەیەك
لەژێر بەفری بێ ئایندەیدا رەق دەبنەوە
ئەو شەوە نازدارانەی
خۆیان بۆ ئاهەنگی رۆژێکی نوێ
وەك بووك دەڕازاندەوە
جارێکی تر زاوای بەیانی نابیننەوە
تا قیامەت بە بێوەژنی خۆیان دەڕننەوە و
دنیا لەگەڵ خۆیاندا
لە تاریکی زوڵمەتدا دەهێڵنەوە

ئای چ زەمەنێکی قەقنەسییە
هەتاو بۆ ماڵی خۆی دەگەڕێ و نایدۆزێتەوە
خوێن لە ئاسمانی چاوەکانەوە بەخوڕ دەبارێ
دڵڕەقی بە شمشێرێکەوە
فەرمانڕەوایی مرۆڤایەتی دەکات
هەموو شەمەندەفەرەکانی ئومێد
لە وێستگەی مەراقە بۆرەکاندا دەوەستن
هەموو خەونەکانی شۆڕش
کەمتیاری کابووس دەیانخوات
هەموو ماڵە ئاوەدانەکانی دڵداریی
دەبنە کەلاوە بێنازەکانی یادەوەریی
هەموو ڕەنگە تریفەییەکانی پێکگەیشتن
لە خومی تەنهایی هەڵدەکێشرێن
هەموو خۆزگە نارنجییەکانی دڵ
کفنی ناسۆر بەبەریاندا دەدورێت
خودایە ئەم زەمەنە چ جەهەندەمێکە و
بە چ خەتایەك تێیکەوتووین؟
دەریا دەبینیت لە تینوێتیدا دەخنکێ
سەفەر بە بەرچاومانەوە سەری خۆی هەڵدەگرێت
ئینجانە ناپاکی لە گوڵ دەکات

شیعر بووە بە هەگبەیەك درۆ

مرۆڤ تەنیا لە کەوڵەکەیدا ماوە

گەرنا دەمێکە تەبیعەتی پڵینگی گرتووە

قەسیدە مەلۆتکەکان

بە یەك ڕۆژ سەریان سپی دەبێت

قەڵەم چیدی توانای نەماوە

ڕەچەڵەکی جوانیی بباتەوە سەر

مرۆڤی ئەم چاخە وەچاخ کوێرە

کۆتایی دەمێکە هاتووە

ئێمە هێشتاش چاومان بڕیوە

لەو سەرەتایانەی وەگ گۆدۆ نایەن

ئاگر لە دارستانی بیرکردنەوە بەربووە و

ئێمە هێشتا خۆمان بە بلیمەتییەوە بادەدەین

ڕەگەزی مرۆڤ

خەریکە بە دەردی دایناسۆرەکان دەچێت

ئێمە هێشتا لە ژماردنی پارەکانمان تەواو نەبووین

خودایە ئەمە چ سەدەیەکی لێڵە

هەموو پێکەوەین

لە بردنی تەرمی هیواکانمان بۆ گۆڕستان

هەموو پێکەوەین

لە ئەسپەردەی ئەو ڕوئیا لاوانەی

لە ناخماندا دەژیان

هەموو پێکەوەین

لە بەردەبارانکردنی کۆتری عەشق و

بە چوار دەوری لاشە بێ گیانەکەیدا

شایی دەکەین

هەموو لەسەر ئەمە ڕێککەوتین

دەستەکانمان چیتر باوەش بەیەکدا نەکەن

لێوەکانمان تیر و شیر لە یەکتر بسوون

چاوەکانمان لە نیگاکردن مان بگرن

دڵەکانمان بکەین بە گۆماوی گومان

لەم دەمەدا ئەوە بە تەنیا خۆمم

بە کێڵگەی ئەڵغامی قەدەغەدا تێدەپەڕم

سەنتوری ئەوین

بۆ تواندنەوەی ڕۆحە سەهۆڵییەکان دەژەنم

لە هەموو میلۆدییەکاندا

بانگت دەکەم

من لێرەم لەسەر ڕێی بیرەوەرییت

لە پەنا هەر هەناسەیەکت

لە ژێر بارانی چاوەکانتا سەما دەکەم

**لە ناو نوێنی داهاتووتدا نووستووم**

**لە بەردەم دەروازەی خۆشەویستیت وەستاوم**

**لە هەواری غوربەتتدا گیرساومەتەوە**

**لەم بیابانە قاقڕەی دنیاشدا**

**کانییەکی تامەزرۆم لە چاوەڕوانیتدا**

**٢٠٢٠-٣-٢٨**

**ڕۆژی شەمە.. کاتژمێر ١١:٤٤**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

هەواڵەکانی ئاژانس و میدیا جیهانییەکان، ڕێژەی تووشبوون و مردن بە کۆرۆنا ڤایرۆس بڵاو دەکەنەوە، من جیاواز لەوەی تێدەگەم ئەم ڤایرۆسە بەرئەنجامی تێکدانی ڕەوشی سروشتە لەلایەن کۆمپانیا مۆنۆپۆلەکانەوە، کە دە بەرابەر بەپێویستی خەڵک کاڵای ناپێویستیان بەرهەم هێناوە، تەنیا و تەنیا بۆ چینینەوەی بڕێکی زۆرتر لە قازانج. بەڵام چاوەڕوانی ئەوە دەکەم ڤاکسینێك بۆ ئەم پەتا یونیڤرساڵە بدۆزرێتەوە، ژینی مرۆڤ ئاسایی بێتەوە و دووریی نێوان مرۆڤەکان کۆتایی بێت. ئاخر ڕەوشەکە هێندە سامناکە لە هەناسەدانی یەکتر دەترسین. ئەم ڤایرۆسە بەشێك لە پرنسیپەکانی نیو لیبرالیزم پیادە دەکات، مرۆڤ زۆرتر لە یەکتر دادەبڕێت و هەموو دەبێت وەك ڕۆبۆت لە دوورەوە بە لای یەکدا تێپەڕین، هەرچی پیر و نەخۆشەکانن چیدی دەرفەتی ژیانیان پێنادرێت. ئەم دەقە لەم زەمەنە ڕەق و تەقەدا لە دایکبووە. ئەمەش پەیامی رادەست نەبوونە بە حوکمی بێ بەزەییانە و قەرەقوشیی کۆرۆنا ڤایرۆس.

# بۆنی مەرگ

لە وێستگەی شەمەندەفەرەکانەوە
لە بنمیچی کەنیسەکانەوە
لە ژێر منارەی مزگەوتەکانەوە
لە شارە کپبووەکانەوە
لە گەڕەکە کاسبووەکانەوە
لە بازاڕە مەلوولەکانەوە
لە شەقامە چۆڵبووەکانەوە
لە ڕووبارە گرینۆکەکانەوە
لە دەریا سەرشێتەکانەوە
لە ماڵە زراوچووەکانەوە
لە قاوشی نەخۆشخانەکانەوە
لە هەوای دڵتەنگی دنیاوە
لە هەناسەی مرۆڤەکانەوە
لە باڵەفڕێی باڵندەکانەوە
بۆنی مەرگ دێت
چ زەمەنێکی ڕەنگ پەڕیوە

یەکەمجارە

مەجنون لە ژوانی لەیلاکەی بترسێت

یەکەمجارە

مەم لە ئامێزی زین تۆقی بێت

یەکەمجارە

شمشاڵ، گوومان

لە هەناسەی شمشاڵژەن بکات

یەکەمجارە

تەنیایی بە یەکسانی

بەسەر هەمووواندا ببەشرێتەوە

یەکەمجارە

دەست لە چاو و

سییەکان لە نەسیمی هەڵکردووی

ماچی یار دوور بخرێنەوە

ئەم هەموو سەرەتا غەمگینانە

لە گیرفانی کام ئافاتەوە

هاتوونەتە دەر؟

ئەم هەموو دەسپێکە دڵتەنگە

ئاهونزولەی کام چەرخی زامدارن؟

ئەم هەموو تۆڕنادۆی کابووسە

لە پەنا ئازاری کام هەسارەوە دێ؟

هیچ تێناگەم
تێناگەم لە هیچ
کوخەکانی لەززەت دەبینم
پڕ بوون لە تەرمی بۆگەنکردوو
دەرگا کراوەکان دەبینم
مەرگ بە خێرایی خۆی پێیاندا دەکا
ژوانگەیەکی چۆڵ دەبینم
بە داری نائومێدییەوە خۆی هەڵواسیوە
لە دوا وەسێتیدا نووسیوویەتی
زەمەنی باوەشە گەرمەکان تونی بابا چوو
ئیدی سەدەی دابڕان و
کوێربوونەوەی دڵی پڕ سروەی منە
شیعرەکان دەبینم
لە دووتوێی دیوانە کەنفتەکاندا
بەسەر یەکدا ترنجاون
ناتوانن چیتر
ڕامووسان لە خۆیاندا جێ بکەنەوە
هێزیان نەماوە
تەوقی تەنهایی کەس بشکێنن
چاو بە ئەسرین
بە کوڵ بۆ بەختی ڕەش و

بۆ ئەو هەموو ماچە چاوەڕوانانەی
ناو دەروونیان دەگرین
گۆڕستانە نوێیەکان دەبینم
تا دێت ئاوەدانتر دەبنەوە
پڕ دەبن لە مردووی بێ ناونیشان
پڕ دەبن لە خۆزگەی هەڵوەریو
پڕ دەبن لە گوڵی خۆر نەدیو
پڕ دەبن لە حەزی تازە شکۆفەکردوو
پڕ دەبن لە خەونی نەبینراو
پڕ دەبن لە هەناری مێخۆش
پڕ دەبن لە نارنجی هیوا
پڕ دەبن لە سترانی ژیان
هیچ تێناگەم
تێناگەم لە هیچ
لە ژووری سەد و یانزەی
نەخۆشخانەیەکی هەمیشە بێدارەوە
تەرمە تازەکان دەژمێرم
هەروەك ئەوەی دلڕەقی ژیان بژمێرم
گوێم لە هەناسەدانی بە زەحمەتە
وەك سەدای تەمبوورێکی خەمبار
دەڕژێتە ناو گوێیەکانم

**گوێم لە بێدەنگی ڕاگرتووە**
**گوێم لە خشەی پێی مردن ڕاگرتووە**
**گوێم لە ڕژانی تەمەن ڕاگرتووە**
**گوێم لە نرکەی نەخۆشێك ڕاگرتووە**
**لە تەنیشتمەوە دەستی لەسەر دڵی داناوە**
**تا دڵنیا بێت هێشتا نەمردووە**
**گوێم لە دەنگی خەیاڵی خۆمە**
**بەسەرمدا دەشیرێنێ**
**چەند لاپەڕەی ژوانت دڕاند**
**چەند خاوخلیچ بوو لە ئۆلۆمپیادی ژیندا**
**چەند چاوەڕوانی توانەوەی جەستەی یار بوویت**
**لە پەرداخی حەزی ڤ گرتووتدا**
**چەند کۆتری شیعرت**
**خستە قەفەزی کتێبەکانتەوە**
**چەند مەست بوویت**
**بە ڕۆژە نەهاتووەکانی داهاتوو**
**لەناکاو دەنگی دکتۆرێك دێت**
**بە بڵندیی قسان دەکات و**
**دەڵێت: نا هیچ نییە**
**حەرفێکی تر لە کتێبی ژیان سڕایەوە**
**گۆڕێکی بێ ناونیشانی تر زیاد بوو**

**ئیستێك دەگرم**

**بە ترسەوە سەیری کاتژمێرەکەی دەستم دەکەم**

**ئاه خودایە**

**چارەگی دەوێت بۆ مەرگ**

**نۆبەتی هەڵفڕینی مەلی گیانمە**

**بەرەو ئاسمانە ڕەش داگەڕاوەکەی عەدەم**

**٥-٤-٢٠٢٠**

**ڕۆژی یەکشەمە**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

**تێبینی:** ئەم دەقە، دەقێکە بەدەم ئازاری نەخۆشییەوە، بە هەناسەسواری و لەژێر ئامێری هەناسەی دەستکرددا لە نەخۆشخانەیەکی دوورە وڵاتدا نوسراوە. سترانێکی غەمباری منە بۆ ئەو ئافاتەی بەسەر مرۆڤایەتیدا هاتووە بە هۆی کۆرۆنا ڤیرۆسەوە. ئێستا کاتژمێر هەژدە و بیست خولەکە، بەپێی ئاماری دوو کاتژمێر پێش ئێستا ژمارەی توشبووانی کۆرۆنا گەیشتۆتە یەك ملیۆن و دووسەد و چل و چوار هەزار کەس، ژمارەی گیان لە دەستدانیش گەیشتۆتە شەست و حەوت هەزار و هەشت سەد و حەفتا و حەوت کەس. هێشتا ڤیرۆسەکە بەخێرایی تیشك بڵاودەبێتەوە. تازە لە بەهاری تەمەنیدایە، تاکو دەگاتە پایزی خۆی، دیار نییە ژیانی چەندی تریش لەگەڵ خۆیدا دەبات.

# هەڵکردنی ئاڵای غەمگینی

له پشت بێدەنگییەکانمەوە

کۆمەڵێ قریشکە هەن

لەناو هەموو قسەکانمدا

رستێك وشەی نەوتراو هەن

له پشتی هەموو سەربردەکانمەوە

چیرۆکێك هەیە هێشتا نەمگێڕاوەتەوە

لەودیو خەمۆکییەکەمەوە

ئاگرێکی نائاسایی هەیە*

ئاگرێك له دڵمدا نێڵه نێڵێتی و

وەك تاڤگەی گڕ

بەسەر بیرکردنەوەمدا دەڕژێت

ئاه چەند ئەو ئاگرەم خۆشدەوێت

که له نێویدا هەڵدەقرچێم

لەوە تۆقیوم ڕۆژێ ئەم ئاگرەم بکوژێتەوە

تاریکی میز بکات بە خۆڵەمێشەکەمدا و

خامۆشیی لەسەری نیشتەجێ بێت

ئای خودایە چ سەرنەویشتێکە

غەمەکان بە قژ ڕاکێشان دەمبەن

دابڕان مافیائاسا دەمڕفێنێت

تەنیایی بەخۆیەوە کەلەپچەی کردووم

ئاه چەند بیری ناو سکی دایکم دەکەم

چەند بێ هیواترم لەوەی خۆم بکوژم

ئەترسم، هەر لەو ڕۆژە ئەترسم

مەرگ منی لە بیر بچێتەوە

درەنگانێك و کاتێ بێمەوە یادی

کار لە کار ترازابێت و

ژیان هەنجن هەنجنی کردبم

شوێنێکی ساغم نەمابێت

زەردەواڵەی غەم پێوەی نەدابێ و

ئیدی بە کەڵکی مردنیش نەمابم

ئەم شمشێری دیموکلیتسە

بۆ ناکەوێتە خوارەوە و

وەك سێوێك قاژم بکات؟

تاکەی دەبێت لە ژێر سێبەری خەنجەر
سەما بکەم و
بەسەر شەقامی چەقۆڕێژی کوێرەوەرییدا
ڕێ بکەم؟
ئاه چ زەمەنێکی دەمبەستراوە
گوڵەکان لە خەڵوەتدان و
لەبەر چەنەبازیی برینەکان
نۆرە ناگاتە سەر هیچ کەس
باسی داستانی خۆی بکات
ئەوە من نیم قسە دەکەم
ئازارەکانمن بە دەنگی بەرز دەدوێن
خۆمم لە دێرێك شیعری عاشقانەدا
لێ ون بوو
خۆمم لە چامەیەکی کەڵەگەتدا
بۆ ئەبەد جێهێشت
کە باسی ئەوینی دەکرد
ئەمێستا من
لە کۆڵانە دۆزەخییەکانی ژیاندا
لەگەڵ وەسوەسەکاندا پیاسە دەکەم و
چاوم بڕیوەتە گەڕەکە فیردەوسییەکانی مەرگ

گریانم بۆ ئەو رابردووە دێت
لە ناو هەموو لاپەڕەکانی تەمەندا
تەنیا مۆمێکی دوورم شك دەبرد
ئەویش کەوتە بەر هەڵمەتی رەشەبا
لەم دنیا بیٚ بنەدا
عەشقێك رۆحی ئاوەدان کردبوومەوە
هەموو دڵڕەقییەکانی یارم گەوار کرد
تا هیچ شتێك عەشقەکەمان نەکوژیٚ
گیانی خۆم دەدایە
بەر فیشەکی لوتبەرزیی مەعشوق
هەوڵمدەدا مانای نویٚ بۆ ژیان بدۆزمەوە
مانایەك گەورەتر بیٚ لە مێژووی مەرگ
کۆششم دەکرد و
خەونم دەبینی
ئەم جیهانە وەك یەك بۆ هەمووان بیٚ
بیٚ فیزانە رێم ئەبڕی
سەرم نە لە باوەشی تەمدا بوو
نە لە ئامێزی یەقیندا
سەرم خستبووە سەر سینگی کتێب و
دڵیشم لە دەریای خۆشەویستی هەڵدەکێشا

هەرچەندە مرۆڤێکی چەپم
بەڵام وتنی ڕاستییەکان ئەرکمە
گۆرانییەکم هەبوو
هیچ کات بۆم تەواو نەکرا و
هەمیشە لە ریزی پێشەوەی
خۆپیشاندانەکاندا بوو
گیتارێکم هەبوو
بۆنی مێخەکی ئازادیی لێ دەهات
ئاوازی یاخیبوونم پێ دەژنی
ئێستا پەنجەکانم لاواز بوون
توانای ختوکەدانی گیتارەکەمیان نەماوە
ئەویش لە گۆشەیەکی ماڵە دوورەکەمدا
سەری خۆی کز گرتووە
شیعرەکانم هێزی ئەژنۆی وجودم بوون
کرێکارانێك بوون
هیچیان بنیاد نەدەنا
بە چەکوشی دەستیان
دیوارەکانی ستەمیان دەڕوخاند
گاسنێك بوون
زەوی شۆڕشیان دەکێلاٚ

داسێك بوون
ریشەی چەوساندنەوەیان دەبڕییەوە
بەسەر تەرمی ئەو رۆژەگارەدا دەگریم
بازم بەسەر بەربەستەکاندا دەدا و
دەمڕوانینە سبەینێیەك
ئاسمانی دنیا سامالْ بێت و
فڕینی باڵندەکانیش ئازاد
نە نووسەرەوەی واقیع بووم
نە حکایەتخوانی وەهم
بە نێو پەرژینە قەدەغەکراوەکاندا
هەنگاوم دەنا و
سترانی هاروهاجی شۆڕشم دەوتەوە
دانی پێدا ئەنێم
سێ بەشی تەمەنم بە فیڕۆ چوو
داوای لە دایکبوونەوەیەکی تر دەکەم
لە دایکبوونەوەیەك
بە هەمان قادرمەکانی شکستدا
سەرم نەخات
میلۆدی یاساغی تێدا نەبیستم
تەنیا لە دایك ببمەوە و

**لێم بگەڕێن**
**سەربەستانە چیم دەوێ**
**ئەوە بکەم**

**٢٠٢٠-٤-١٥**
**ڕۆژی چوارشەمە**
**کاتژمێر: ١٤:٢٠**
**ئەڵمانیا - بیلەفێلد**
**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

**دووبارە و چەند بارە شیعرێکی ترم لە دایک بوو لە زەمەنی کۆرۆنادا. ئەو ڤیرۆسە خەریکە دەست دەبات بۆ گۆڕینی ریشەیی دنیا، لەگەڵیدا ڕەنگی شیعرەکانی منیش دەگۆڕێن. من شیعر بە بەند و باو نازانم تا بە شان و باڵی واقیعدا هەڵبدەم یان لەگەڵ واقیع بیگونجێنم، بەڵام هەر مرۆڤێک کوڕی کۆنتێکستی خۆیەتی، دنیای دەرەوەی خۆی ڕەسمی هزر و ڕەفتاری دەکەن. زەمەنەکە پۆست بێهودەییە، بێهودەیی بەسەرچوو. شیعری منیش قۆناغێکی جیاواز دەبڕێ.**

***لێرەدا ئاگر هەمان ئەو ئاگرە باشلارییەیە، گاستۆن باشلار لە ساڵی ١٩٣٨دا لە کتێبی "دەروونشیکاریی ئاگر"دا تیۆریزەی کردووە.**

## خۆشم ئەوێی بە شێوازی خۆم

ناخۆشە بە خنکان بمریت
دوو جار هەستم بەوە کردووە
خەریکە دەخنکێم
باسی ئەو جارە ناکەم
ویستم خۆم هەڵبدەمە ڕووبارێکەوە
نا، لەو دوو جارە دەدوێم
شووشەی ئارەزووەکانم هاڕەیان کرد
دڵی شکاوی خۆمم بینی
لەسەر شۆستەی شارێکی نەناسراودا
لەو دەمەشدا نرکە نرکەکەم
ئاوازی خۆشەویستی دەچڕی و
خۆشم دەوێی
بەسەر لێوی سڕبوومەوە
بەرەو مەنزڵی دڵت هەڵدەفڕی

زۆر جاری تریش

لە ژێر پۆڵای فەرامۆشیتدا

هەست بە شکانی پەرداخی غرور و

بلوری شیعرەکانم دەکەم

تۆ تێناگەیت

خۆشەویستیم لەسەرو

هەموو شتێکەوە ڕاگرتووە

وەك دوا ئاینی خۆم

پەرستشەکانی ئەنجام دەدەم

ڕەنگە پرسیارت هەبێت

چیم لە خۆشەویستی دەستکەوتووە؟

چەند زامێکی قووڵە

لەسەر نەریتی بازرگانی

لە خۆشەویستی بڕوانیت

خۆشەویستی ئەو کاتە مانا پەیدا دەکا

هیچت لێی دەست نەکەوێت!

هیچت لێ دەست نەکەوێ

جگە لە گەیشتنەوە بە خۆت

لە دڵی ئەو ماشووقەی

لەسەر ڕێی بێ شانسییەکانت وەستاوە

نا، خۆشەویستی دەستکەوت نییە
گەر شتێکت لێ دەستکەوت
وێڵی ئەو دەستکەوتانە بوویت و
خۆشەویستیت لێ ون بووە
بۆیە بە بێ دەستکەوت
بەوپەڕی دەست بەتاڵییەوە
دەڵێم خۆشم دەوێی
لەوانەیە سەر لە جنونم دەرنەکەیت
بە یەك ڕۆژ هێندەی دەساڵ
غەم دەخۆم و
مەی دەردەسەریی دەمخواتەوە
بەڵی من وام
ئەو غەمە شیرینانەم خۆش دەوێت
پێش ئەوەی تۆ پێم بڵێی مازۆخیت
خۆم بە ڕاشکاوانە دانی پێدا دەنێم
سەرشێتێکی مازۆخیم
ڕەنگە پێتوابێت دەبێت بڕۆم
سەردانی پزیشکی دەروونی بکەم
باشە دەڕۆم
بەڵام پێش ئەوە پرسیارێکم هەس

کام پزیشك هەیە
حەز بە غەمە شیرینەکانی خۆشەویستی و
ژیانی سەرمەدیی نێوان مەمك نەکات؟
سەرت لێم سوڕماوە
گاهێ وا دەزانی خەون دەبینی و
گاهێك بە سەرسامییەوە پێمدەڵێی
بڵێی لە دنیادا
دوو ڕووبار هەبن هێندەی ئێمە سازگار
دوو مەل هەبن هێندەی ئێمە یاخی
دوو عاشق هەبن هێندەی ئێمە شێت؟
ئەم وتانە دڵخۆشم دەکەن
ختوکەی شعورم دەدەن
یار لەوە تێگەیشتووە کەوتووەتە
ناو کام بیری خۆشەویستی و
کام چیرۆکی بێوێنەی ئەڤینداریی
بە زەردەخەنەیەکی شەرمنەوە
بە گیرفانی پڕ چوکلێتی شیعرەوە
بە ئارامی و لەسەرخۆ پێت دەڵێم
خۆشم دەوێی
خۆشم دەوێی بە شێوازی خۆم

خۆشم دەوێی و

نامەوێت هەر لە دڵتدا زیندان بم

دەمەوێ دوورگەکانی لەززەت

لەسەر نەخشەی جەستەت بدۆزمەوە

لە مردنم دەترسیت

هێشتاش بیر لە ئازاردانم دەکەیتەوە

کەلەپچەی هۆگربوونم توندتر دەکەیت

خوێنی زۆرترت دەوێت و

دەخوازی زۆرتر دەماری هەستم نەزیف بێ

دڵنیام لەوەی مردنم نزیکە

با وای دابنێین سەد ساڵی تر دەژیم

ئەمە چی لە دنیا دەگۆڕێت؟

هەر کات مردم دوودڵ مەبە لەوەی

دنیایەك خەونی نەبینرا و

مێژوویەك لە ژانم

لەگەڵ خۆم بردۆتە گۆڕێکی بێ ناونیشانەوە

بیر لەو وتەیە دەکەمەوە

یەکێك هەبوو دەیووت

هیچ ژیانێکی شایستە

لەناو جیهانێکی ناشایستەدا بوونی نییە

ئاساییە ئەگەر ژیانی منیش
لە ئاستی ئەو هەموو خەونانە نەبووبن
هەموو کاتژمێرێك دەیانبینم
رەنگە ئیدی خەونی تر نەبینم
یان دانە دانە پوچیان بکەمەوە
ئەم دنیایە زۆر لەوە ناشرینترە
خەونی جوانی تێدا ببینی
ئای ئازیزم
خەونەکانیش رەونەقی جارانیان نەماوە
وەك ئەوەن مار بۆ سەری خۆت
بەخێو بکەیت
زمانم تەتەڵە ناکات و
دەمەوێت رووی دەمم بکەمە
ئەو تارماییانەی
لە هەموو شوێنێك بە دوامەوەن
تا ڤامی ئەوە بکەن
سۆراغی یارم لە هیچ شوێنێك نەکەن
ئەو تەنیا لە ناو شیعرەکانمدایە
لێی بگەڕێن بە ئارامی لەوێ بنوێت
شوێنی ئەو، ناو دڵی دیوانەکانە و

منیش هەر لەویٚ لەناو

گۆڕی قەسیدەیەکی غەمناکدا راکشاوم

هەرچەند ئیدی خەون نابینم

هەرچەند دوو وشەم خۆش ناوێت

"ڕێگرەکان و هەلومەرج"

بەڵام بۆ زیز نەبوونی خەونەکانی تۆ

بە بێدەنگی و بە چرپە پێتدەڵێم

خۆشم دەوێی بە شێوازی خۆم

خۆشم دەوێی و

لە پەنا خۆتدا داڵدەم بدە و

لە زینداني کولتوور دەرمبهێنە

پڕ بە کامی ڕۆح ماچم بکە

بەڵام ئاخ، هێشتاش تۆ

سڵ لە گۆڕینەوەی ماچ و

پێکگەیشتنی لەشەکان دەکەیتەوە

کەوتوویتە دەریای عیشقەوە و

خۆت بە چڵی رزیوی نەریتەوە گرتۆتەوە

تا لافاوی ئارەزوو نەتبات

ئاگات لەوە نییە

خەونەکانی من وەك باڵۆنێك

زۆر بەرز بوونەتەوە
نەکەیت بە سوژنی نەریت
لاقەبرغەیان کون کون بکەیت
ئاخر ئەی نازەنینم
ئەم ژیانە بۆ من چیتری تیایە
جگە لە باوەشی تۆ
جگە لە پێکەنینی نەرمی تۆ
جگە لە پەنجە میهرەبانەکانت
کە سازی عاتیفەی من دەژەنن؟
تۆش ئەی شاژنی خەونەکان
ئەی کەوسەری رۆحی تینووم
ئەی چرۆی سەوزی پایزی تەمەنم
لەگەڵم وەرە
تا ئەودیوی تخووبەکانی چێژ
تا گەڕەکەکانی ئارامی
تا کۆڵانە دڵخۆشەکانی ژوان
با منیش بە دەم سەماوە
لە ژێر ئاسمانێکی باراناویدا
لە ولاتی زوقم و شەختەدا
پێت بڵێم

**خۆشم دەوێی بە شێوازی خۆم**

**خۆشم دەوێی و**

**لە ڕێی ئەم شیعرە نەخوێندەوارەوە**

**هاوار دەکەم**

**خۆشم دەوێی**

**٢٠٢٠-٤-٢٧**

**ڕۆژی دووشەمە**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

**کاتژمێر: ٤:٣٠**

**ئەم تێکستە نازانم ناوی بنێم چی!؟، بەڵام وەك عەتارێك هەموو وشە بۆندارەکانم خستۆتە بۆتەی ئەم تێکستەوە. چیرۆکی ئەم دەقە، گەردەلولی خۆشەویستییەکە رایماڵیوم، تاکو ئێستا خۆشەویستیمان بینیوە تەنیا یەك بەرگی لەبەردا بووە، کەچی ئەم خۆشەویستییە بەرگێکی جیاوازتری کردووەتە بەر، هەندێك ئەکشنی ئەم خۆشەویستییە لە نێو خەون و خەیاڵدان، بۆیە رەنگە ئەم تێکستە گێڕانەوەی خەونێك بێت، خەونێك چۆڵەوانی ژیانمی پێ ئاوەدان بکەمەوە. بۆ نا، لەم رۆژگارەدا ئەوەش نیعمەتە توانای خەونبینینت مابێت.**

# خۆشەویستییەکی جیاواز

هەموو خۆشەویستییەك
پارچەیەك نییە
لە ئەڵماسی جوانی بووبێتەوە
هەموو خۆشەویستییەك
هەورێکی دڵناسك نییە
بە کزەبایەك شی بێتەوە بۆ باران
خۆشەویستی هەیە
پڕیەتی لە ئەنگیزەی سادیستانە
خۆشەویستی هەیە
خۆشاردنەوەیە لە پەنای سۆزدا
بۆ ماوەیەکی کاتی
خۆشەویستی هەیە
گڕکانی هەوەسێکی کپ بوو و
خولیای دەستکەوتی سێکسییە

خۆشەویستی هەیە

تیمارکردنی برینەکانی دوێنێیە

بە دەرمانەکانی ئەمڕۆ

خۆشەویستی هەیە

گوومان کرمێی کردووە و

بۆنی دراو

کەپووی ئاخنیوە

خۆشەویستی هەیە

راکردنە لە واقیعێکی دژوار

بەرەو کەتوارێکی ناهەموارتر

خۆشەویستی هەیە

داگیرکردنی جەستە و

بە کەلاوەبوونی دڵە

خۆشەویستی هەیە

گەمەی برینێکی دێرینترە و

خوێنی ناگاتە هەنووکە

خۆشەویستی هەیە

راکردنە بەناو دالأنەکانی درۆدا

سەرئەنجامەکەشی

دەسکەنەکردنی دابڕانە

خۆشەویستی هەیە
ماسکێکی ڕووخۆشە
هەزاران چەقۆی لە خۆیدا حەشارداوە
خۆشەویستی هەیە
رقە لە خودی خۆشەویستی و
حەزی وێرانبوونی ڕۆحە
خۆشەویستی هەیە
رەنگی مردووی لێ نیشتووە و
وەك گەمەی میکانۆی
نێوان ڕۆبۆتەکان وایە
خۆشەویستی هەیە
وێڵبوونە لە بیابانی نادڵنیایی و
بەربوونەوەیە بۆ ناو باخەکانی وەهم
ئەوانەی تەنیا لە نێو تەمی خەیاڵدا
بوونیان هەیە
خۆشەویستی هەیە
هەلاهەلابوونی خەونێکی مەزنە و
راکردنە بە دوای خەونێکی بچکۆلەدا
خۆشەویستی هەیە
پاڵنانی بەردەکەی سیزیفە

## بەرەو نادیار

خۆشەویستی هەیە

لە سەرەتاوە دوا وێستگە دەبینیت

وەك سەرنشینی شەمەندەفەرێك

تیکتەکەت تا ئەو وێستگەیە دەخوات

پارەکەیت لە پێشدا داوە

خۆشەویستی هەیە

وەك وەنەوزێك وایە لە باوەشی سۆزانییەکدا

دواتر هەست بە تەریقبوونەوە دەکەیت و

چنگ دەکەیت بە غروری ڕژاوتدا

خۆشت نازانیت بەرەو کوێ هەڵبێیت!

خۆشەویستی هەیە

گۆڕستانێکی ئێجگار فراوانە

هەزاران قەبری بەتاڵی تێدایە بۆ

ئەسپەردەی خەیاڵە یاقووتییەکان و

کۆترە شینکەی هەست و

سەدان ڕکاتی نوێژی شەیدابوون

خۆشەویستی هەیە

لێوی نییە بۆ ڕاموسان

دەندووکی هەیە

بۆ بریندارکردنی لەشی بەرائەت
خۆشەویستی هەیە
هیچی تێدا نابەخشرێت
وەك دەریالووشێك هەموو شت دەبات
بە تەنیٚ جەستەیەکی شەکەت
لە شەڕگەیەکی کاولبوودا جێدەهێڵێت
خۆشەویستی هەیە
ناچاریی بەڕێوەی دەبات
هەر کەس جانتای سەفەری ئامادەیە و
لە دەرفەتی گونجاودا
ڕێگای پێشووی خۆی دەگرێتەوە بەر
خۆشەویستی هەیە
بەردەلانێکی رووت و قووتە
رەیحانەی تێگەیشتنی لەسەر ناڕویٚ
شووشەی دڵی لەسەر دەشکیٚ
خۆشەویستی زۆر هەن
بوارم نییە هەموویان بژمێرم
هەمووشیان ناویان خۆشەویستییە
بەڵام کاتێك نۆبە دێتە سەر خۆمان
بە بڕێکی زۆری دڵنیاییەوە دەڵێم

خۆشەویستی ئێمە جودایە
نازانم بڵێم چ جۆرێکە!
ڕەنگێکە لە دەرەوەی هەموو ڕەنگەکانی تر
ئالوودەبوونە بە مەوادێکی تر
لە دەرەوەی ئەو ماددە هۆشبەرانەی دەیانناسین
فۆرمێکە جیاواز لە هەر کلێشەیەکی تر
ناویم بۆ نانرێت
تەنێ ئەوەندە دەزانم
خۆشەویستی ئێمە تایبەتمەندە
مێژوو دەسڕێتەوە و
داهاتوو بنیات دەنێت
پەرژینەکانی جوگرافیا دەبەزێنێت
جیاوازیی تەمەن
لە دەستاڕی ماچێکدا دەهاڕێت
خۆشەویستی ئێمە
ناوێکی دیاریکراوی نییە
تا فەرهەنگی عیشقی
بە دوا بگەڕێی
خۆشەویستی ئێمە
هەروا بێ ناو دەمێنێتەوە

**هەر کات ناونرا**

**دەبێتە رابردوویەکی تاڵ**

**لێگەڕێ ئەم خۆشەویستییە**

**تا سەر بێ ناو بمێنێتەوە**

**ڕۆژی دووشەمە**

**١١-٥-٢٠٢٠**

**کاتژمێر: ١٣:٥٥**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

## هێرۆکیلفیای خۆشەویستی

خۆشەویستی میراتی پەپوولەکان نییە
تاپۆش نەکراوە لەسەر ماڵباتی گوڵەکان
تا ئەوەی ڕەگەزی نەچێتەوە سەر باخ
یان سولالەی نەگەڕێتەوە بۆ نێرگز
نەتوانێت تامی ئەو هەنگوینە بکات
ئەی هێزی خۆشەویستی لە کوێیە
دڕندەیی گورگ نەکاتە پەموو
دەرگا پۆڵاینەکان
لە کورەی خۆیدا نەتوێنێتەوە و
کوپەی چاوەڕوانی پڕ نەکات
لە کۆنیاکی پێک گەیشتن؟
ئەگەر خۆشەویستی گەرای جوانی
لە زەمەنە ناشرینەکاندا دانەنێ
چ سوودێکی هەیە؟

گەر خۆشەویستی مریشکێك بێت

لەسەر هێلکە پاییزییەکان کڕ نەکەوێ

ئیدی چۆن جوجەڵەکانی بەهار بترووکێن؟

گەر خۆشەویستی، سیحر

لە نیازە پیسەکان نەکات و

نەیانگۆڕێت بۆ خولیا مەلۆتکەکانی

ناو بێشکەی بەرائەت

لە سەفسەتەیەکی ناو فەرهەنگی زمان بەولاوە

چی مانایەکی تری هەیە؟

گەر خۆشەویستی کودەتایەك نەبێت

بەسەر دڵە ڕەش هەڵگەڕاوەکاندا

کەی کەڵکی هەیە

ئەو بارە قورسە لەسەر شانمان دابنێین؟

گەر خۆشەویستی کارێکە

تایبەت بێت بە مرۆڤە ڕوح ناسکەکان

کەواتە چ درۆیەك لەمە شاخدارترە

کە دەڵێن عیشق توانای گۆڕینی

قەوزەی هەیە بۆ دارچنار؟

خۆشەویستی گەر کتێبی گریان بێ

سەرچاوەی ژانەدڵ و

خەو زڕانی ئەو هەموو شەوە بێت

بڕیار وایە خەونی نیانی تێدا ببینین

هەقوایە وەك بكوژێك

لە دادگایەكی سەربازییدا

بە تۆمەتی چەندین تاوانی ئاشكرا

فەرمانی قەنارەی بۆ دەربكرێت

گەر خۆشەویستی نائارامی دەروونی و

توانەوەی مۆمی دڵی یەك تاكە كەس بێ

ئەمە چ جوانییەكی لە خۆگرتووە؟

تا زووتر لەو نەخۆشییە دەروونییە

دوور بكەوینەوە هێشتا درەنگە

گەر خۆشەویستی تەنها

ڕێگا پێچاوپێچەكانی دڵەڕاوكێ و

كەوتنە ژێر داروپەردووی غەم بێت

شۆڕشكردن لە دژی

دەبێتە ئەركێكی گشتیی

گەر خۆشەویستی فیلمی دابڕان و

سڕینەوەی كۆی یادگارییەكان و

ئامێزگرتنەوە بێت بۆ شیزۆفرینیا

ئەم بەڵا و نەگبەتییە

بۆچی دەبێت پیرۆز بێت و
ئاینێك بێت بۆ هەمووان؟
گەر خۆشەویستی تەنیا ماچ بێ
پڕ نەبێت لە گڕکانی هەست
لە هاتوچۆی ماڵە سۆزانییەك زیاتر نییە
یان تەنیا پەیوەندییەکی ڕۆحی بێت
ئەوە کاری مرۆڤ نییە و
دەستبازیی نێوان خێوەکانە
گەر خۆشەویستی شەڕ بێت
پێویستیی بە خوێنی ئاڵ و
شەڕگای بێشوومار و
تەرمی لە ژماردن نەهاتوو بێت
پێش ئەوەی نەفرەت لە خۆی بکەین
دەبێ دەمکوتی هەموو ئەوانەش بکرێ
فوو دەکەن بە شەیپوورەکەیدا
گەر خۆشەویستی درۆ بێت
وەهمێکی عەنقائاسا بێت
دالغەی خەوخۆشێك بێت
دەبێت سیخوڕمە لە کەمەری مرۆڤ بدرێت و
توند توند دەستی بگریت و

بیهێنێتە ناو ئامێزی واقیع
گەر خۆشەویستی
هەڵقوڕانی پێکی نیگەرانی و
خومخانەی داهاتوو بێت
مەزادخانەی هەست و
قومارخانەی ڕۆح دۆڕاندن بێ
دەبێت بیر لەوە بکرێتەوە
وەك ماددە هۆشبەرەکان یاساغ بکرێت
گەر خۆشەویستی کێڵگەی مین و
وڕك گرتنێکی هەرزەکارانە بێت
چ پێویستمان بەم گەمە شێتانە هەیە؟
با بە گسکی هۆشمەندیی
ئەو خاشاکە بخەینە تەنەکەخۆڵەوە
ئای چەند سەیرە
کاتێك من ئەم ڕاستییە دەزانم:
خۆشەویستی وزەیەکی ترە
هێشتا زاناکانی ئەتۆمی پەیان پێ نەبردووە
جیهانێکی تەژی ئەفسوونە
خوداکان دروستیان نەکردووە
کتێبێکە نووسەرەکەی دیار نییە و
مێژووی لە چاپدانی لەسەر نەنوسراوە
هەر ئەوەندە دەزانین

لە چاپخانەی ئەستێرەیەکی تر چاپکراوە
تەختە زەوییەکی شەق بردووە
لە درزەکانییەوە لالەزاری لەززەت و
بەیبوونی شیعر سەری دەرهێناوە
توانەوەی وشەکانە
لە نێو رستە بێ ماناکانی ژیاندا
سەرلەنوێ نووسینەوەی
یادداشتەکانی روئیا و
گێڕانەوەی حکایەتەکانی حەزرەتی جوانییە
گڕوگاڵی منداڵێکە
گەورەیی لە چارەی نەنوسراوە
وەك ئەوەی ئۆتیزمی هەبێت
هیچ کات دنیای زارۆکیی جێناهێڵێت
ئاوەدانکردنەوەیەکی تری زەوییە
بە پاککردنەوەی ئەم هەسارەیە
لە چڵکی کینە نەزۆکەکان و
سڕینەوەی شوێن پێی تەنهاییە
لەسەر راستە شەقامی لێکئاڵان
دە تۆش وەرە ئەی میهرەبان
من ئەو بەورە نەزانەم
هیچ لە رێساکانی دڵ تێناگەم
تامەزرۆم، خۆری ئەوینت

تاریکییەکانم روون بکاتەوە
پێشوازیی لەو دڵەم بکە
کە پێشتر گاشەبەردێك بوو
ئەمێستا بووەتە لۆکە
هێمنتر لە هێمنی هەنگاو بنێ
دەست مەخەرە ناو رابردووم
تازە تەلی بچڕاوی کەمانچەی دوێنێ
بە کولاندنەوەی زامەکان گرێ نادرێتەوە
پیانۆیەکی نوێم گەرەکە
ریتمە کۆنەکان نەناسێت
عەزفی خۆشەویستی سەرمەدیی
تۆی لەسەر بکەم

رۆژی چوارشەمە
٢٠-٥-٢٠٢٠
کاتژمێر: ١٠:٣٠
ئەڵمانیا- بیلەفێلد

تێبینی: لە ترسی مردن و فریانەکەوتن بۆ درکاندنی رازێکی تری خۆشەویستی، دوای خوێنبەربوونێکی زۆر ئەم تێکستە لە دایك بوو، کە هیچ رووخسارێکی شیعری پێوە دیار نییە. ئەمە هەستێکە و تێکەڵی روانینی فیکرییە.

# ژنێك پێش بە مردنم دەگرێت

ئای چەند شادومانم
دڵت خوێندەوارە و
دەتوانێت نامەکانی ڕۆحم بخوێنێتەوە
ئەو نامانەی قردێلەی تەنهاییان
لە پرچی ماشوبرنجیان کردووەتەوە
ئەو نامانەی هەمیشە چاوەڕێیان دەکەیت و
بە سینگتەوە دەیاننووسێنیت
وەك ئەوەی لە باوەشم بگریت
ئای چەند خۆشبەختم
لەو غروبەی خۆشەویستی ئاوا بوو
لەو پێدەشتەی سەری ئینجانەیان قرتاند
لەو سەحرایەی چاوی ئاویان دەرهێنا
لەو ئۆقیانووسەی چرایان تێدا خنکاند
لەو مەملەکەتەی هەموو شەقامەکانی
بۆ تەنهایی قیرتاو کرابوون و
هەمیشە دەیانبردیتەوە بۆ لای
باخە سووتماکەکانی سۆز
لەو چرکەساتەی بارانی نەگبەتی

بە خوڕ بەسەرمدا دەباری
منت ڕاکێشایە ژێر سەیوانی دڵت
ئەو هەموو لوغمی ئازارەت
لە بن پێمدا دەرکێشا
ئەو هەموو نیانییەت نیشاندام
بێ ئەوەی لە ڕەگوڕیشەم بکۆڵیتەوە
منت بردەوە سەر توخمی بەهار و
کراسە چرچ و زەردبووە خەزانییەکەت
لەبەر داکەندم
توند توند دەستت گرتم
هێشتا لە ڕاڕایی ئەوەدا بووم
تۆ بڵێی ئەم دەستە ناسکانەش
بە ناوی پیاسەوە
لە باخە فیردەوسییەکانی ئەویندا
بەرەو دۆزەخی فیراق نەمبات؟
هەروەك جادووگەرێك
دەستت گەیشتە بیرکردنەوەم و
بە تۆنێکی ناسکتر لە قاسپە
پێت گووتم
دەستم بگرە و توند توند بیگرە
ئێمە ئیدی بەناو تخووبی هەوردا
بەدەم سەماوە تێدەپەڕین
ماڵێکی پەمەیی

لە کەناری رووباری ماچ و
لە پەنا مزگەوتی موحیبەتەوە
بە گەڵا و گوڵ چێ دەکەین
ئای چ بەختەوەرییەکی سەیر دایگرتووم!
من چاوەڕێی سووتان بووم
لە ئاگری دوورە وڵاتیدا
چاوەڕوانی توانەوە بووم
لە کورەی عەشقێکی ناکامدا
چاوەڕێی پەرتبوون بووم
لەناو رۆژژمێرێکی بێ ساڵدا
چاوەڕوانی ئەوە بووم وجودم
لە ئەرشیفخانەی پەراوێزخستندا
یەك بار تۆزی لێ بنیشێت
هەر لەم دەمەدا
هاتنی تۆ شۆڕشێك بوو
دوێنێی ژێراوژوور کردم و
ئەمڕۆی بە خەندە بنیاتنام و
سبەینێم لەنێو ژنێتیتدا دەپشکوێتەوە
هەروەك ئەوەی بزانیت
لە خواری خوارەوەی ناخی مندا
عەشقێکی چەخماخەدار هەیە
پێت گووتم ئەی پیاو
نامەوێت لێرەدا بکوژێیتەوە

وەرە لەگەڵم، وەرە
لە نێو مندا دەست پێبکەرەوە
بە پەلەپڕوسکێ هاتم
لەو ڕۆژەوەی هاتووم
هەر جارەی دوورگەیەکی نەبینراو
لە جوانییەکەت دەدۆزمەوە
ئای چەند بەختیارم
هەمیشە لە گەڕاندام
بەنێو ڕەنگینیی هەستە کڵپەدارەکانتدا و
تا مردن لێ نابمەوە

رۆژی پێنج شەمە
٤-٦-٢٠٢٠
کاتژمێر: ١٧

بەدەم ئازاری سەرەتان و چارەسەری کیمیاییەوە لە ژوورێکی نسرم و کزۆڵەدا فەنتازیا پەرش و بڵاوەکانم کۆکردەوە، ئەم شیعرەم لێ دروست کرد. لێ باش دەزانم ئەگەر ئازار لێ گەڕابا زۆر باشتر لەمەی ئێستا دەمنووسی، بەڵام خیانەت لە هەستم ناکەم و ژانی ئەم شیعرە مێشکی گرتبووم هەردەبوو ڕێ بدەم وەك ئەمەی ئێستا لە دایك ببێت.

# خۆشەویستیت
# دەستی گرتمەوە بۆ نێو ژیان

لە بەیانییەکی زوودا

خەو لە چاوەکانم تۆرا بوو

لەگەڵ ژنێکی بۆن خۆشتر لە نێرگز

بە پاپۆڕی چێژ

زەریای لەشی یەکترمان دەبڕی

بە شەرمێکی نازدارەوە پێی وتم

تۆ بڵێسەدارترین پیاویت

سوڵتانی ئەوین و

چرای خۆشەویستییەکی ئەزەلییت

سینگت پڕە لە ڕووناکی و

لە درزی هەموو خەیاڵێکەوە

دێیتە ناو ماڵی تەنهاییمەوە

خەت خۆشترین نووسەریت

لە نووسینەوەی ئەو خەونانەی

لە دەرگای واقیع دەدەن

لێوڕێژیت لەو لاپەڕە خرۆشاوانەی

مێژووی ماچیان لەسەر نوسراوەتەوە

هەر زۆر زوو

زریانی گریان کپ دەکەیت و

دەروازەی مێژوویەکی نوێ دەکەیتەوە

تەژی لە بارانی موحیبەت و

لێوانلێو لە میوەی شیعر و

پڕ پڕ لە ئومێدی پێکگەیشتن

گوێم لە هەناسە سەوزەکانتە،

لە پشت چیای ئیرۆسە

چاوم لە شەپۆلی ئارەزووتە و

نیازم هەیە لە نێو مێرگی تەڕی دڵتدا

ببمە چەند دڵۆپێك حەز و

بەسەر ئەمڕۆ و بەیانیتدا بتکێم

چەند عادەتێکی جوانت هەیە

لە دەمی وەریندا

دەبیتە چرۆیەکی تازەی ناو بیرکردنەوە

لە ئانی سووتانی باخەکانی پێکەنین

خەون بە ژوانێکەوە دەبینیت

تەڕتر لە ئاو و

شەپۆلاویتر لە دەریا و

ئاوەدانتر لەو قەرەباڵغییەی ئاسمان

مێشکت جمەی دێت لە بیرۆکە

بیرۆکەیەك بۆ بەردەوامی عیشق و

بیرۆکەیەك بۆ گەڕانەوە بەرەو نیشتمان

یەکێکی تر بۆ دڕاندنی دوا نامەی خۆکوشتن و

ئەوانیتر هەر هەموو

بۆ ڕاونانی دێوەزمەی نیگەرانی

ئەو هەرچی جوانییەك شك دەبات

دەیداتە پاڵ ئەو ڕۆحە شەڕانگێزەم

زمانم تەتەڵە دەکات

ناچارم وەك تینوویەك

ستایشی نیانی ئاو بکەم

وەك بەساڵاچوویەکی نەخوێندەوار

بە زمانی پەتی دڵ بۆی بدوێم

پێکی ئەم تەنهاییە بڕژم و

لە چەمی زەردەخەنەی هەڵبکێشم و

بێ هەناسەبڕکێ پێی بڵێم

من لە دارستانە گڕگرتووەکانی سۆزەوە هاتووم

بە نێو دیوارە کۆنکرێتییەکانی زەمەندا تێدەپەڕم

لەمسەری حکایەتی نەبڕاوەکانی عیشق و

لەوسەری رووبارە هەڵچووەکانی ئارەزووەوە

سەر دەردەهێنمەوە

بە پێچەوانەی یاساکانی بایۆلۆژیاوە

دڵم دوای مێشکم دەوەستێت

تەنیا لەبەر ئەو هۆکارە سادەیەی

عەشقی تۆی لێ دەچۆڕێت

تۆ دەبێت لەوەش حاڵی ببیت

عەشق دوای مردنی هەموو شتەکانیش

بە زیندوویی دەمێنێتەوە

هێندە ئاڵۆزکاوم خۆمم بۆ شەرح ناکرێت

هێندە لێڵیان کردووم

خۆم بۆ حونجە ناكرێت

هێندە پەتۆی درۆیان دا بەسەرمدا و

وەك ئەوەی بە خەتێكی ناشرین نووسرابمەوە

كەس كەس جگە لە تۆ

منی وەك دێڕێكی تەواو بۆ نەخوێندرایەوە

خۆ ئەوە من نیم تاریك بم

هەمووان جگە لە تۆ

بە چاویلكەی ڕەشەوە تەماشایان كردم

من نامەوێت بە دیار ئازارەكانمەوە ڕاتگرم

نامەوێت مێژووش تۆمار بكەین

مێژوو لە مێژە كۆتایی هاتووە

چیتر هیچ شتێك ناچێتە ناو مێژووەوە

ئێمە ئێستا عاشق و تامەزرۆی یەكترین

ناوی خۆمان

لەناو كتێبی ئێستادا تۆمار دەكەین

من باش دەزانم

ژیان هێندە كورتە

وەك ئەوە وایە بە شەمەندەفەر

لە کۆپنهاگنەوە بەرەو مالمۆ بڕۆین

دەی ئازیزم

ئێمە بڕیارماندا بە ئەوینێکی قووڵ

تەمەنمان درێژ بکەینەوە

لەم تەمەنە تولانییەشدا

هەر لەباوەشی یەکتردا بمێنینەوە

٢٠٢٠-٦-١٥

نەخۆشخانە "براکفیە کلینیکۆم"

کاتژمێر هەشت و چارەگی بەیانییە، چەند شریقەیەك خوێنیان لێگرتووم بۆ تێست، دکتۆرەکەم پێیوایە تووشی تالاسیمیا بووم. بێ ئاگا لەوەی خوێنی عەشقێکی گڕگرتوو لە ناو دەمارەکانی مندا هەیە. ئەو خوێنەیە ناهێڵێت من لەناو ژیاندا ببم بە لاپەڕەیەکی هەنجن هەنجن. خەریکە لە زانست بکەومە شکەوە، چۆن تا ئێستا نەیتوانیوە دەستی بگات بە کەشفی ئەو ئێنرژییەی، خۆشەویستی بە ژیانی مرۆڤەکانی بەخشیوە و زیندوو رایان دەگرێت؟.

# لە چەمی ئارەزووتدا مەلە دەکەم

ڕەنگە پێت سەیر بێت
هەمیشە یەک گۆرانی دەڵێم
یەک خەون دەبینم
ئەم خەونە دووبارانە
تۆیان بێزار کردووە
چون ئەو جۆرە ئەو خەونانەن
لە مێژە کەس نایانبینێت
هەمان ئەو خەونە ماندووانەن
لە سەردەمی باپیرانمانەوە بەسەرچوون
ڕەنگە ڕەوشتێکی تایبەتم هەبێت
بەردەوام قسەکانی دوێنێ دەکەمەوە
لە قاموسی ئەمڕۆش
وتەکانی سبەینێ ئامادە دەکەم
یان هەمیشە بەو ڕێگایانەدا دەڕۆمەوە

سەد جار شکستم لیٚ چنیونەتەوە

چەشنی سیزیف

تاوێری دڵێکی سەرهەڵگرتوو

بەرەو کێوی نێو خەیاڵەکانم سەردەخەم

لەوانەیە تەبیعەتم

هێندە نزیك نەبێت لە ئاو

بە بەردەلآنی هەموو دڵێکدا ریٚچکە نەگرم

پیٚدەچێت ئەوندەش رووت نەبم

خەمە مۆرهەڵگەڕاوەکانی ژێر پیٚستم ببینریٚت

دڵڕەقانەش زمانی ژانەکانم دووریوە و

تەنها رێم بە رۆحم داوە

لە هەموو کۆڵآنە مەکرەبازەکانی ئەویندا

پڕ بە گەردوون هاوار بکات و

گوێی یار پڕ بکات لە هەقیقەت

خۆم بە باشی دەناسم

سلاّو لەو تەیرە ماندووانە دەکەم

دێنە کەناراوەکانی موحیبەت

تینوویٚتی خۆیان دەشکێنن

هەندێك جاریش

دەکەومە ژێر هەرەسی ئەندێشەوە

جەنازەی خۆم بە کۆڵدا دەدەم و

لە دڵی ژنێکدا ئەسپەردەی دەکەم

ڕەنگە تۆ هێشتا نەزانیت

چەند برین لە وجودمدایە

چەند ڕمی چاوەڕوانی لە جەرگم چەقیوە

کەچی هێشتا لاوکێکم

بەسەر زمانی بارانەوە

خوڕ خوڕ بە چاوی ئاسماندا دێمە خوار

کەشتییەکی ئومێدەوارم

لە هەناوی دەریایەکی بزردا

چاوم بڕیوەتە کەنارێکی هێمن

من نازانم چۆن دڵی خۆم بکەمەوە

نازانم بە حەرفەکانی درۆ خۆم بنووسمەوە

ناتوانم لەبەر ئاگردانی هیچ خودایەك

بۆ تاوێك خۆم گەرم بکەمەوە

هێندە فەرهەنگی وشەکانم هەژاربوون

جگە لە ناوی تۆ

جگە لە حکایەتی ئارەزوویەکی سەوز سەوز

لە شەوێکی سوور سووردا

لەسەر پێخەوێکی سپی سپی

ناتوانن باسی هیچی تر بکەن

بۆی هەیە پێتوابێت

شاعیرێکم لە هیچ شاعیرێکی تر ناچم

خەونێکم کەس نەیبینیووم

وەرزێکی راکردووم و

براکانم لە ئامێزی ساڵ دەریانپەڕاندووم

قەڵەمێکی ترم

جیاواز ئەنووسم لە هەموو قەڵەمەکانی تر

دەفتەرێکی سەرشێتم

سینگم یادگاریی

ئەو پەپولە جوانەمەرگانەی لەسەر نووسراوەتەوە

بە بۆنی باخچە کەوتن

تۆ هەرچی بڵێیت راستە

خۆشم هەست بەم جیاوازییانە دەکەم،

لە ناو ناخی مندا

دەنگی سێ کەو دێت

ئەوەی تەنیا شەوان دەناڵێنێت

ئازارە جەستەییەکانمن

بە قامچییەکانی شێرپەنجە ئەشکەنجە دەدرێن

ئەوەی بەیانیان دەکەوێتە گریان

ئەوە نوستالیژیاکانمن

خوویان بە وتنەوەی سترانەکانی دوێنیوە گرتووە

ئەوەی هەمیشە لە قاسپە قاسپ ناکەوێت

شیعرە یاخییەکانمن

لە بارەی عەشقی تۆوە دەدوێن

لە بارەی ئەو شەوە چاوەڕوانکراوانەوە قسە دەکەن

من و تۆ

لەژێر لێزمەی راماوساندا دەخوسێین

بەختەوەریی ونبوومان

لە باوەشی یەکتردا دەدۆزینەوە

کراسی شەرمنیی لەبەری یەك دادەکەنین و

بە رەیحانەی شیعرێکی ئیرۆسی

خۆمان دادەپۆشین

ستیانی رابردوویەکی لێڵ

لە مەمکەکانت دەکەمەوە

بە حەریری هەستێکی تەڕ تەڕ

ستیانێکی ترت لە چێژ بۆ دەدورم

دەستی ماڵئاوایی

بۆ رۆژە قەوزەگرتووەکانی دووریی

بەرز دەکەینەوە

به هەنگاوی هێمن و لەسەرخۆ

دەچینە ناو ئایندەوە

لەویَ لە ماڵی ئاینده

خۆمان دەدەینە بەر رێژنەی لەشی یەکتر

تۆفانی لەززەت

لە بەرپێماندا هەڵدەستیَ و

لە نێو مێرگی بزواوی ئازادیدا

بۆ هەمیشە دەمێنینەوە

٢٠٢٠-٦-٢٣

کاتژمێر: ١٦:٣٥

رۆژی سێ شەمە

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

تێبینی: ئەمرۆ هەستم بە تەنگەنەفەسی زۆر کرد، هەناسە توندییەکانم لەم شیعرەدا سووك بوون، هەواڵەکانی دەرەوە هیچ خۆش نین. بەم تێکستە خۆم لە واقیع دزییەوە. لەم سەردەمەدا کە سەردەمی ماسکەکانە و چیتر یەکتر ناناسینەوە. ئەوەی پێشووتر وەك یۆتۆپیایەك دەبینرا ئێستا وەك دیسپۆتیایەك لەسەر زەوی خۆی نمایش دەکات.

# بە ئەوینت ڕابردووم بسڕەوە

ئەی تاقانەترین ژنی ئێستا
پەردەی گوڵگوڵی ئەوینت
بدە بەسەر زامەکانی رابردوومدا
نامەوێت دوێنێم دیار بێت
ئەمڕۆم دەوێت
کە تۆ بە ئەسپایی و نەرمییەوە
مینا ئەستێرەیەك
لەم شەوەزەنگەمدا هەڵدێی
نامەوێت بڵێی ئەوە چۆنە
لەم دنیا پان و پۆڕەدا
تەنیا ئینجانەی غەمباری من
ئاو دەدەیت!
دەخوازم پرسیار نەکەیت

به هەنگاوی خێرا

شەوە رەش هەڵگەڕاوەکانت جێبهێڵە و

بە پەلە و بروسکەئاسا

بەرەو رۆژە سپییەکانم وەرە

منیش گسك لە دیرۆك دەدەم

ماڵێکی نوێ لە گەڵاّی شیعر و

ئاوریشمی شەیدابوون چێ دەکەم

بەناو تەلبەندی زەمەندا تێدەپەڕین

لە باوەشی ئێستادا دەمێنینەوە

هیچ کات نابینە رابردوو و

هەنگاویش نانێین بۆ داهاتوو

ئێمە دوو بولبولی سەرشێتین

کوڕ و کچی ئەمڕۆین

پشتمان لە ئازارە دێرینەکانە

چیرۆکی عەشقمان دەنووسینەوە

لە هیچ وێستگەیەك

نوقتەی دوا دێڕ دانانێین

رەنگە بڕوا نەکەیت

چەمی خەونەکانم

پڕ پڕن لە ماسی ئارەزووی تۆ

لە دێڕی هەر شیعرێکمدا

تۆ سەرەتاتکێ دەکەیت

لە پیاسەی هەموو خەیاڵەکانمدا

بە تەنیشتمەوە ڕێ دەکەیت

دەستم دەگریت بۆ بینینی

تەرمی ئەو ڕۆژانەی

لە چاوەڕوانی دۆزینەوەتدا

پێک پێک کارەساتم هەڵدەقوڕاند و

هۆن هۆن فرمێسکەکانم

وەك دڵۆپە شەونم دەچۆڕانە

سەر گەڵای تەمەن

ڕەنگە بڕوا نەکەیت

گشت ڕۆژئاوابوونەکانم

لە چاوەڕوانی کازیوەی تۆدا

لە سارای چاوەڕوانییەوە هەڵدەدێران و

نائومێدانە خۆیان دەکوشت

هەموو پێکەنینەکانم

برینگەلێك بوون بەسەر لێومەوە دەوەرین و

لە ناو تاریکی بێ تۆییدا ون دەبوون

کۆی درۆکانم

عەودالی ئەوە بوون

ڕۆژێك بگەنە ئەو ڕاستییەی

تۆ لەسەر کەلاوەی بێ نازییم

بەیداغی ئاوەدانکردنەوە هەڵبدەیت

ڕەنگە پێت سەیر بێت

بۆچی زمانم بەسترا بوو

بە بێدەنگی بۆت دەدوام!

هەستم دەکرد ئەم بێ پەیڤییە

ئاوێکی لە کوڵە و ڕژاوەتە هەناومەوە

خەنجەرێکە لە دڵمدا

شووشەیەکی شکاوە لە گەرووما

زایەڵەیەکی کەپولاڵ بووم

وەك بەفری بەر هەتاو

بێ ناڵە و هاوار دەتوامەوە

هەستم دەکرد

ئاسمانی بازنەیی تۆ، ڕۆژی روونە

هیچ کاتێك تاریك نابێت

تا وەك ئەستێرەیەك تیایدا بدرەوشێمەوە

هەستم دەکرد

ژیانت زۆر لەوە قەرەباڵغترە

پیاوێکی کێویی تێیدا جێگەی بێتەوە
درێژەم بە بێدەنگی دا
تا لە ڕێگەی شیعرێکی شەرمنەوە
بانگەوازی خۆشەویستیتم ڕاگەیاند و
بە ئاسوودەیی سەرم نایەوە

٢٠٢٠-٧-١٣
ڕۆژی دووشەمە
کاتژمێر: دووی بەرەبەیان

تێبینی: شەوێکی چاوەڕوان، بیر دەکەمەوە چەند سەعاتێکی تر ئەنجامی پشکنین و چارەسەرەکەم چی دەبێت؟. زۆر درێژەم نەدا بەو بیرکردنەوەیە کە ئەوسەری لە تێفکرینی نەرێنییەوە دەردەچوو. بەم شیعرە پرۆسەکەم ئاوەژوو کردەوە. لەگەڵ تەواوبوونی دوا دێڕدا هەستم بەوە دەکرد خەوتووم، بەدەم ئازار و بیرکردنەوە لە نەخۆشی و ناخۆشییەکانی ژیان ئەم شیعرەم نووسی وەک سترانێکی نوێتر بۆ ژیان و بۆ خۆشەویستی.

# ئای.. شەقامی چاوەڕوانی چەند درێژە

رۆژێک دێت

کۆتایی بەم چاوەڕوانییە دێ

سەرلەنوێ دەست دەکەینەوە

بە ڕازاندنەوەی رۆژەکان

بە سبوغی خۆشەویستی و

دڵدانەوەی شەوەکان

بە هەڵکردنی مۆمێکی ئارەزووباز

کە تا کازیوە

لە پەنا سیسەمە بۆندارەکەمانەوە

تاریکی لە رۆحمان بتەکێنێ

کۆڵەپشتی دووریی دادەگرین

## چاوی تەڕمان

به ئاوریشمی شیعرێك دەسڕین و

له پەنا زەردەپەڕی دڵنیاییدا

ئاورینگی هەستمان

دڵۆپ دڵۆپ

بەسەر یەكدا دەڕژێن

له شەمەندەفەری پەژارە دادەبەزین

جامێك ئاو

له كارێزی ئەوین دەخۆینەوه

به زەردەخەنەوه به یەكتر دەڵێین

ژیان هەمیشه له پشت چیای

چاوەڕوانییه درێژەكانەوه هەڵدێ

بێن دەنێین

به كوپه زەخرەفەدارەكانی شادمانییەوه

پێك پێك

پێكەنین دەخۆینەوه و

به گوێی یەكتردا دەچرپێنین

دوایی ئەو هەموو تامەزرۆییە

وا بەستەڵەکی غەریبی

بە گەرمیی لەشمان دەتوێتەوە

بە تەنیشت باخەکاندا تێدەپەڕین

گوێ لەو باڵندانە دەگرین

لە زمانی عەشق تێدەگەن

ئەوان بەم دێوانەبوونەی من و

ئەو دڵە پڕ حەسرەتەی تۆدا

دەماننناسنەوە

سەری شووشەی عەتری خەیاڵەکانمان دەکەینەوە

بۆنی هەر خەیاڵێکی منداڵکارمان

دنیا دەکاتە گوڵستان

گۆرانی خۆمان دەڵێین

قورگی نووساوی ژیان

پڕ دەکەینەوە لە نۆتەی تەڕوبڕ

دەچینە رۆخی رووبارێك

پەیمانێکی نوێ دەبەستین:

چیتر من بە قەسیدە مەحزوونەکان

برینەکانم نەلاوێنمەوە

تۆش هەموو سەرە سەعاتێك

بە گۆزەی شانتەوە

بێیتە سەر کانیلەی سۆزم و

پڕ بە گۆزەکەت

شەرابی دڵخۆشیی ببەیتەوە

دەچینە کیشوەرێکی ئارام

لەوێ تەنیا زمانی جەستە بدوێ و

قەپاڵ لە سێوی لەززەت بگرین

تا وەك پەڕەی شیعرێکی ناسك

لەژێر بارانی ئارەزوودا دەخوسێین

ڕۆژێك دێت

کۆتایی بەم چاوەڕوانییە دێت

ئەو بۆشاییە جوگرافییەی نێوانمان

بە ئامێزی یەکتر پڕ دەبێتەوە

ئەو کێوە بەفرینەی تەنهایی

**لە نێوان هەردوو لێوماندا**

**بە هالاّوی یەك تاکە ماچمان**

**هێمن هێمن دەتوێتەوە**

**ڕۆژێك دێت**

**کۆتایی بەم چاوەڕوانییە دێت**

**ڕۆژێك دێت...**

**٢٠٢٠-٧-٢٩**

**ڕۆژی چوارشەمە**

**کاتژمێر: ١٩:١٥**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

ئەمڕۆ هەستم بە دڵتەنگی زۆر کرد، کۆرۆنا دنیای بێ ڕەنگ کردووە، من بەم شیعرە ئومێدەوارە رووبەڕووی ئەو دابڕان و دوورییە بوومەوە ئەو ڤایرۆسە نەفرەتییە لەنێوان خۆشەویستاندا وەك دیوارێکی کۆنکرێتی قووتی کردووەتەوە. ئەم شیعرە باس لە قۆناغی پۆست کۆرۆنا دەکات کە ژیان دەگەڕێتەوە باری پێشووی خۆی. ئەگەرچی ئەو بارەی پێشووش بۆ من جێگەی ڕەخنەی جیددی بوو، بەلاّم ئەم ناهەموارییەی کۆڤید نۆزدە بەسەر دنیای هێناوە، دەمانەوێت لانیکەم دنیا بگەڕێتەوە بۆ باری پێشووی، یان مرۆڤایەتی بەهۆی ئەم درمەوە تەکانێك بدات بەرەو باشتر لە دنیای پێشووتر.

## دەنگی نووساوی خەیاڵ

باوەشی هەستت بۆ دەکەمەوە

دەریات بۆ دەخەمە گۆرانی

فانۆسەکان وا لێدەکەم

دەستی ڕووناکی بگرن و

پێکەوە لە بەردەمتدا سەما بکەن

ئاوت بە پەنجەی خەناویی

عاتیفە، بۆ دەژەنم

تەنها بۆ ئەوەی لە مەعبەدی دڵمدا

بۆ هەمیشە بمێنیتەوە

سوێندت بۆ دەخۆم

بە چاوی شینی شیعر

بە جێژوانی خوساو لە ماچدا

به پرچی زەردباوی تیشك

به پێکەنینی گەرمی هەتاو

هەموو کات

یادەوەرییە تەڕەکانت

به سینگی وشکمەوە بنووسێنم

بەڵێنت پێ ئەدەم

وەك کۆترە شینکە

لەسەر گومەزی ڕۆحت بنیشمەوە

خۆم له گڕی عیشقت هەڵسوم

پەنجەرەی غەمگینی لەسەر خۆم دادەخەم و

پێکەوە دەرگای ئومێد دەکەینەوە

تا پیربوونی وجود

تا ریش چەرمۆبوونی زەمەن

له دڵی تۆدا دائەگیرسێم و

هەر لەوێش ئەکوژێمەوە

پەیمانت پێ ئەدەم

تا قەڵەم له خوێنم بخواتەوە

تا ئەسرین میوانی ئەبەدی چاوەکانم بێ

تا سنووری نیشتمان

لە ئەندێشەی مندا فراوانتر بێت

تا کەڵبەی غوربەت

لەشی ناسکی شیعرم بجوێت

تا مەراقەکانم کەڵەگەتتر بن

تا باڵقبوونی خەونە ساواکانم

بەرەو تۆ بێم و

خۆمت تێدا بخوێنمەوە

بەڵێنت پێ ئەدەم

بە خۆم و برینەکانمەوە

بە خۆم و سەرەڕۆییەکانمەوە

بە خۆم و تەنهاییە نارنجییەکانمەوە

بە خۆم و غەمە بۆرەکانمەوە

بە خۆم و قریشکە سورفلەکانمەوە

بە خۆم و خۆزگە چرچەکانمەوە

بە خۆم و ڕوانینە ئاڵۆزەکانمەوە

بەرەو تۆ بێین و

لە ماڵی بە تریفە داپۆشراوتا

لە زێی ڕوونی حەزەکانتا

ئۆقرە بگرین

وەلێ من لە ئۆقیانووسی خەیاڵدا

سەوڵی بێهودانە لێ دەدەم

هێشتا بەخۆم نەزانیوە

دەمێکە خنکاوم

کەچی هیچ کات سەرم

لەو نهێنییە دەرنەچووە

بۆچی فێکرتنی قەسیدەکانم

تەنها ڕاڤەی نەهاتنەکانت دەکات؟

زریکەی خنکاوی فەنتازیاکانم

حونجەی ئەو باوەشانەیە

هیچ کات پێم ناگەن

تاریکبوونی ڕووناکییەکەم

بە تاڵبوونەوەی ئەو نزایانە

بۆ ئایندە دەمکردن

بەڵام ئازیزم

هێشتاش چاوەڕوانم

لەسەر ڕاستە شەقامی عومر

بەدەم پیاسەیەکی سەرخۆشەوە

من و تۆ پێک بگەین

تۆ و من پێک بگەن

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

٢٠٢٠-٨-١١

ڕۆژی سێشەمە

کاتژمێر: ٢٣:٤٥

شەوێکی هێمنە، دنیا کشوماتە، جارجار خشەی پێی سستەرەکان "کرانگ شڤێستە" دێت، منیش خەریکی نووسینی ئەم شیعرە شڵەژاوەم، هەرچەند ویستم گەشبینانە لەگەڵیدا بڕۆم، بەڵام وەک ئەوەی ئەو بمنووسێتەوە، کۆتاییەکەی بەو جۆرە بوو لە نێوان چاوەڕوانی و بێ ئومێدیدا بمێنمەوە، نازانم ئەم جادەی چاوەڕوانییە چەند درێژ دەبێت، بەڵام مرۆڤ لە نەخۆشخانەدا هەر ئەمەندەی من دەتوانێت گەشبین بێت بە داهاتوو، داهاتوویەک هیچ لەوە ناچێت ڕووداوی خۆش لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. نازانم بۆچی هەر چۆنێک بنووسم، زمانی شیعرم دەچێتەوە سەر ڕەگەزی حوزن؟ کەسێکی لێ نییە ئەم شیعرەی بۆ بخوێنمەوە و وەڵامم بداتەوە.

# ڕەشنووسی شیعرە تەواونەکراوەکان*

ژیان وەك سیگارێك دەمكێشێت

دواتریش

بە فیزەوە فڕێم دەداتە سەر شۆستەیەك و

توند لە بن پێلاوەكانیدا دەمفلیقێنێتەوە

بەڵام من زۆر لەوە بێ عارترم

بیر لە چارەنووسم بكەمەوە

پێم خۆشە تا دوا نەفەس

بەسەر لێوییەوە بمێنمەوە

****

من وشەیەكم

لە دێڕی شیعرێكدا دەتوێمەوە

مێشكی شاعیرێك چاڕس دەكەم،

به چاوشارکێ لەگەڵیدا
دەیان لاپەڕەی پێ ڕەش دەکەمەوە
خۆم نادەم به دەستەوە
ئاخر وشەیەکی خزم
له دێڕێکی تەنگدا جێگیر نابم
پانتایی گەردوون
به بەری من تەسکە
ئەم قسەیەم بۆ پۆزلێدان نییه
دەبێت به نیانیمدا بمناسنەوە
من وشەی "خۆشم ئەوێی"م
****
خەیاڵەکانم ریشیان سپی بوو
له چاوەڕوانی ژنێکدا
که پۆرترێتەکەیم
لەسەر ڕۆژژمێری تەمەنم
ڕەنگ کرد
نه ئەو له بۆتەی خەونێکەوە
دێتە دەرەوە
نه من ماندوو دەبم له ڕاکردن
به دوای کڵاوی بابردووی خەیاڵدا
****

چەمێکم لیخن کراوم
بێزم نایەت لە ئاوێنەدا
لە لێڵی خۆم بڕوانم
هەموو شەوێك خەون
بە ڕۆژانی روونیمەوە دەبینم
ئەمە ڕێسایەکی کۆنکرێتییە
کاتێ چەمێك لیخن دەکرێت
لە هیچ شوێنێك خۆی ناناسێتەوە
تەنها لە کۆشی خۆکوشتندا نەبێ
****

خۆمم ون کردووە
نە لە هەندەران خۆم بۆ ئەدۆزرێتەوە
نە لە کوچە گرینۆکەکانی نیشتمان
نە زەوی لە خۆیم دەگرێت
نە ئاسمان دەرگام لێ دەکاتەوە
نە ئەستێرەیەك پرسیارم دەکات
نە "راین"** بەهۆی ئەلزەهایمەرەوە
شێوەمی بیر دەکەوێتەوە
دۆشداماوم لە کوێ ون بووم
پێویستە بێباك بم لە کوێ ون بووم
گرنگ ئەوەیە، لە قەسیدەیەکدا
وەك لەشی مەعشووق رووت و قووت

**خۆم بدۆزمەوە**

****

**فریودراوین**

**زۆر دەمێکە فریویان داوین**

**بەو هەقیقەتە وەهمیانەی**

**لە ناو کتێبی مێژوودا نوستوون**

**بەو خۆشبەختییە فریودراوین**

**ڕەنجی سیزیفی بۆ ئەدەین و**

**لە گۆدۆیەك زیاتر نییە**

**ئێمە دەمێکە فریو دراوین**

**بە ژیان لەناو ئەو تابووتەی**

**ناوی لێنراوە دیموکراسی**

**ئێمە لە مێژە فریو دەدرێین**

**بە پێکەنینی شەیتانەکانی سیاسەت و**

**گریانی دەلاڵەکانی نیشتمان**

**ئێمە هەر فریو دەدرێین و**

**فریو دەدرێین***

**٢٦-٨-٢٠٢٠**

**ڕۆژی چوارشەمە**

**کاتژمێر: ١٢:٢٥**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

*ئـەم شـیعرانە تـەواو نـەکراون، هـەروا بـە تەواونـەکراویی دەیانهێڵمـەوە، ئەگـەریش نۆبـەت هاتـە سـەر چـاپیان هـەر تـەواویان ناکـەم، چـوونکە دەستکاریی هەست و غەم و ئازارەکانی ئەم چرکەساتەم دەکات. با هەروا بن. لێ من قەت پاکنووسی دووەمی هیچ شیعرێك ناکەم.

**هێمایـە بـۆ رووبـاری "رایـن" کـە وەك خـۆم بـە پێچـەوانەوەی بـاوەوە رێ دەبڕێت.

***ئەمڕۆ رۆژێکە هەست بە هەناسەتەنگی دەکەم، هەم لەبەر نەخۆشییەکەم، هـەم بـەهۆی ئـەو بارودۆخـە دەروونییـەی تێیـدام، چارەسـەری کیمیـایم یـەك سـاڵی تـەواوی تێپەڕانـد، وەك چـۆن لـە چـەند سـاڵی پێشـوو دوو خـولی ناوبـەناوی یـەك سـاڵەم تێپـەڕ کردبـوو. سـەرم هێنـدە قورسـە لـەوە دەچـێت ئەسـتێرەیەکیان لەسـەر دانابێـت، بـەڵام بـەهۆی ئـەم تێکسـتە بزڕکـاوەوە نەمهێشت، غەم شمشێری خۆی لە خوێنـاوم زۆرتـر ڕا بـدات. ئەوەتا دەبینـم لەگـەڵ چاپی هـەر پیتێکـدا غەمـەکانم وەك گـەڵای پاییزان دەوەرێـن، بیرتـان نەچـێت باسـی غەمـەکانم دەکـەم، ئەگـەرنا ئـازارە جەسـتەییەکانم هێنـدەیان خۆش دەوێم وەك مەعشوق دەستیان تێناچێت جێمبهێڵن.

## گوێم لە دەنگی پێی هاتنتە

ئەی ئەو ژنەی
شیعرەکانم هەموو شەوێک
خەونت پێوە دەبینن
لە ئەشکەوتی خەون دێمە دەرەوە و
ڕۆحی بەستووم
دەخەمە بەر نێڵەنێڵی ئاگری عەشقت
بەرگی شڕی دێوانەییم
بە تەناف چارەنووستەوە هەڵدەواسم
لەو کاتەی هەست بە تەنهایی دەکەیت
من لە دەلاقەی شیعرێکەوە دێم
ئەو دەمەی خەیاڵەکانت ڕەش دەپۆشن

بەدەم سەمایەکی سپی سپییەوە دێم

ئەو وەختەی دوور دووریت

لە درزی گۆرانییەکی نامۆوە دێم

هەرچەندە

سەرم خستووەتە کۆشی ئازارەوە

لەسەر دۆشەکی دڵەڕاوکێ پاڵکەوتووم

شانم لەسەر سەرینی ترس داداوە

بە پێی شەریعەتی کوێرەوەریی

غەمگینیم مارە کردووە

تۆش دەتوانیت بە سەبەتەیەکەوە

بێیتە بێستانی هەستم

تا دەتوانی کاڵەکی ماچ بڕنی

تۆ دەتوانیت بە ئەسپایی

بە نێو کێڵگەی وجودما

هاتوچۆ بکەیت

ئامێز بەو حەزانەدا بکەیت

مێژووی تاڵمان دەسڕنەوە و

باوەش بە گوڵە بۆنخۆشەکانی ئایندەدا دەکەن

تۆ دەتوانیت بە قەڵەمێکی رووخۆشەوە بێیت

لەسەر دیوارەکانی یادەوەرییم

بە خەتێکی خۆش، بنووسیت

تێپەڕی زەمەنی خۆکوشتن

تا مردن زراوی بتەقێت و

پێکەوە بەنێو ژیاندا رەت بین

ئاوڕ لەو رۆژانە نەدەینەوە

پێناسەی ژوانمان بۆ نەدەکرا

تۆ دەتوانیت هەر ئێستا

بە پەلەپڕوسکێ لە دەم کەلی ئومێدەوە

لەم تاریکستانەی مندا هەڵبێی

کوخە کشوماتەکەم پڕ بکەیت

لە جریوە جریوی پاساری ئەوین

تۆ دەتوانیت بە چنگێك رووناکییەوە

بێیت بۆ ژێر کەپرە چاوەڕوانەکەم

هەردوو پێکەوە، کتێبێکی نورانی

لە بارەی خۆشەویستییەوە بنووسین

باس لە خەونە فێدارەکانی من و

خولیا داگیرساوەکانی تۆ

لە ژێر پشکۆی دڵمدا بکات

تۆ دەتوانیت لەگەڵ ئەو موسافیرانە بێت

جانتاکانیان تەژیە لە رۆندك و

خەیاڵەکانیان لێوانلێو لە سەرکێشی

لە وێستگەکانی باراندا

بە دوامدا بگەڕێ

تاکە کەسم چەترم پێ نییە

کراسێکم لەبەردایە لە رەنگی شیعر

شەرواڵێکی تەڕی ناو دەریای عەشقیش

کاسکێتێك لەوەی "بەکر عەلی"م لە سەردایە

کە هێشتا خوێنم نەیکردووەتە گوڵاڵە

تۆ دەتوانیت هەر کات ویستت بێیت

بەلاَم پێش دادرانەوەی پەردە

لەسەر شانۆی تەمەنم

بەر لەوەی ببمە دێڕێکی ونبوو

لە ناو قەسیدەیەکی سەر بە گۆبەندا

چەند ساتێك بەر لە ڕژانم

لە ناو پەرداخی ژیانەوە

بۆ سەر خۆڵی تینووی نیشتمان

٩-٩-٢٠٢٠

ڕۆژی چوارشەمە

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

ئەمڕۆ تومۆرەکەی ناو مێشکم ئەکتیڤتر لە جاران شەڕم لەگەڵ دەکات، سەرئێشەکەم گەیشتووەتە رادەی بورانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەمان ئەو مێشکە کۆڵ نادات لە چالاکی، لە بەرەنگاریی. ئەم دەقە بەشێکە لەو شەڕە بەردەوامەی نێوان من و مەرگ. دەبێت هەمیشە ئەوە بزانرێت، ئەم دەقانە ئەدەبی بەرگرین، بەرگریی لە ژیان و خۆشەویستی. ئەم دەقانە بەدەم ئاهونالەی شێرپەنجەوە دەنووسرێنەوە، ڕەنگە لە داهاتوودا ئەگەر ئەم شیعرانە چاپیان بینی، بکەونە بەردەستی ڕەخنەگرانێك هیچ لە ئازاری شێرپەنجە و مانەوەی درێژخایەن لە نەخۆشخانەکانی کیشوەری زوقم و بەفر حاڵی نەبن. بۆ نا، هەمیشە ئولفەتمان گرتووە بە شکاندنی کەسێتی نووسەرەوە نەك هەڵسەنگاندنی دەق.

## بە درێژایی تەمەن چاوەڕوانتم

ناتوانم

پەنجەرەی رِوونی شیعرم دابخەم

تامەزرۆیی لە چاوی خەونەکانم بشارمەوە

فرمێسکەکانم رابگرم

لەو ئانەی سەرم شۆڕ کردووەتەوە

بەسەر ئەلبوومی یادەوەرییدا

بەر بە تسۆنامی خەیاڵەکان بگرم

کە لەناکاو لەگەڵ خۆی دەمبات و

لە باوەشی تۆدا خۆم دەگرمەوە

ناتوانم

زمانی ئەو قەسیدە میهرەبانانە ببڕم

لە وەسفی جوانیی ئەوینێکدا

گوڵ لە هەناسەیانەوە دەپشکوێ

یان ببمە جەلاد

ئەو شۆڕشانە سەرکوت بکەم

ڕێیەکیان دەچێتەوە سەر

میهرەبانی ژنێکی ئاوارە و

ڕێیەکی تریان دێتەوە سەر

مێژووی شێتییەکانی خۆم

ناتوانم

ئەو ڕۆژانە ون بکەم

بەسەر لەشی شەقامێکی دڵتەنگدا

هەنگاومان دەنا

دڵی کزەبامان دەدایەوە

لەسەر پەڕەی ڕۆحی یەکتر

پەیمانی ئەبەدیمان هەڵدەکۆڵی

یان دەمی ئەو شەوانە بدوورم

بە تەنها هەست قسەی تێدا دەکا و

گڕ لە دارستانی تەنهایی بەر دەدا

ناتوانم

توند ئێخەی ژیان نەگرم

کە وەك دوو نەورەسی ماندوو

لە سۆزی دەریا دابڕیوین

قەدەرمان بووەتە سروودێك

بۆ ژانی دووریی

گریانێك بەسەر ئەو خۆزگانەی

وەك دارمەیتێكی رزیو

بەسەرشانی چارەنووسمانەوەیە

یان مۆسیقارێكی غەمگین نەبم

شمشاڵێك نەژەنم

دڵی پڕ نەبێت و

قوڵپی گریان لە قورگیدا قەتیس نەمابێت

بۆ ئەو نیشتمانەی لە تولەڕێی كۆچدا

بۆ ئەبەد ونمان كرد

ناتوانم

خوێنم بپاڵێوم لە عەشقی ژنێك

لە گۆڕستانی دیوانێكدا دەمدۆزێتەوە

گوێی دەخاتە سەر سینگم

هەست بە ترپەی شیعرێك دەكات

بۆنی نێرگزی هەقیقەتی لێدێت و

تامی هەناری خۆشەویستی دەدا

یان نەڕوانمە مێژووی برین

ئەو برینانەی خوێنی وەڕسییان لێ دەچۆڕێ و

هەمیشە خوێی ڕەشبینی دەیانکزێنێتەوە

ناتوانم

پێڵاوی سەفەر لە پێ داکەنم

لەوەتی هەم کۆچبەرم

لەنێوان ڕۆژهەڵاتی دڵی تۆ و

ڕۆژئاوای پووچییەکانی خۆم

یان بەرگی گریان لەبەرم داکەنم

لە ترسی ئەوەی

جگە لە کراسی فرمێسک و

شەرواڵی هەنسک

جلێکی تر شك نابەم

ناتوانم

بە ئاسمانی وشەدا نەگەڕێم

موسافیرێك نەبم

لەودیو هەورەکانی خەیاڵەوە

بە شانەی ئاڵتوونی شیعر

نێرگزی پرچت دانەهێنم

یان فانۆسێکی لەخۆبردوو نەبم

تا دڵم لە ترپە ترپ دەکەوێت

لەسەر هەموو ڕێگا شێدارەکانی عەشق

لە هەموو کۆڵانەکانی تەمەن

بە حەسرەتەوە چاوەڕوانت نەبم

٢٦-٩-٢٠٢٠

ڕۆژی شەممە

کاتژمێر: ١٦:٣٠

خۆرئاوای زەوی - ڕۆژێکی بارانایی

# گۆرانی دەڵێم تا برینەکان گوڵ دەردەکەن

گۆرانییەك بە خوێنمدا دەگەڕێ
سەری سێڵاوی نهێنی بردوویەتی
گۆرانییەك لە دڵمدا دێت و دەچێت
ڕەگەزی دەگەڕێتەوە سەر
شارستانییەتی زەردەخەنە
گۆرانییەك وەك گڕکان
لە مێشکمدا تەقیوەتەوە
باسی دڵتەنگی پەپولەیەك دەکات
گڕی گریان باڵەکانی سووتاندووە
باسی ماسییەکی کلۆڵ دەکات
لە دەریای فرمێسکدا
کتێبی دڵەڕاوکێ دەخوێنێتەوە
باسی موسافیرێکی تۆقیو دەکات
جانتای ڕاڕایی لە شاندایە و

ڕێی بەختی خۆی نادۆزێتەوە

باسی چرایەك دەكات

لە تاریكایی شەو یاخی بووە

تا بەرەبەیان حكایەتی ئەوین

بۆ ئەو "با"یە دەگێڕێتەوە

بۆ ڕۆحكێشانی هاتووە

باسی مردوویەك دەكات

لە گۆڕستانی ژیاندا نێژراوە

هەموو شت لە چاویدا خۆڵەمێشییە

تەنانەت لە میحرابی پێكەنیندا

چاوی پڕ ئەسرینی هەڵدەگلۆفێت

باسی تەوارێكی زامدار دەكات

لەشی غەم دەكرۆژێ

بەسەر بەرزترین لوتكەوە

سێبەری تەنهایی خۆی دەبینێ

پەتی حەوسەڵەی رزیوە و

بە دەم حەسرەتكێشانەوە

قاچی دەخزێتە ئامێزی پیرییەوە

باسی نەوڕەسێكی ماندوو دەكات

بەشی تەوافێك بەدەوری دەریادا

هێزی فڕینی نەماوە
بەشی تریقانەوەیەك بەدەم باوە
گەشبینی لە دەروونیدا نەماوە
بەشی خۆکوشتنێك
ئومێدی بە مردن نەماوە
بەشی ژوانێك لەژێر دەواری ئیرۆسدا
بیانووی نەماوە
باسی گەڵایەکی چرچ بوو دەکات
لە ژێر پێی ڕێبوارێکدا دەپلیشێتەوە و
دوا گلەیی خۆی لە باران دەکات
کۆتا وشەی لە هەناوی خۆیدا دەنێژێت
باسی درێژترین قەسیدە دەکات
کورتترین ڕێگای عەشقی نەبڕی
لە چەرخی کەڕبوونی هەستدا
پێش ئەوەی زمانی ببڕن
لە زیندانێکی تاکەکەسیدا،
بە کەتەر دەماری خۆی بڕی
باسی کێڵگەیەکی وشکبوو دەکات
لە چاوەڕوانی چینینەوەی باراندا
"تا"ی مەئویستی گرتووە

هیچ کانیاوێك بەنێویدا ڕەت نابێت
ناوچەوانی گەرمی فێنك بکاتەوە
بەدەم چرپینی سروودی ئاوەوە
مزری لە چەندان لاوە درز دەبات
باسی مەلەوانێکی سەرەڕۆ دەکات
خۆی دەداتە بەر تووڕەترین شەپۆل
خەونە خنکاوەکانی وەك لاشەیەك
لە قوورگی ئۆقیانووس دەهێنێتە دەرەوە
نازانێت لە کوێ ئەسپەردەی بکات
ناچار بەدرێژایی تەمەن
وەك بارێکی گران لە کۆڵی دەنێت
باسی گوڵە سەوسەنێك دەکات
شمشاڵی بەهاریی دەژەنێت
گورگی پایز دەیکاتە نێچیری خۆی
لە بری خوێن، بۆن دەڕژێ و
دڵی باخچە بۆ هەمیشە دەشکێت
گۆرانییەك لە خەیاڵمدا دەبارێت
خۆش ناکاتەوە
تا برینەکان گوڵ دەرنەکەن
تا ڕۆحە کوێرەکان نەبینن

تا داری خۆزگەکان بەر نەگرن

تا دەرگای ئارەزوو نەکرێتەوە

تا من و تۆ بەیەك نەگەین

رۆژی سێ شەممە

٦-١٠-٢٠٢٠

کاتژمێر: ١٢:١٥

خۆرئاوای زەوی - کەنار رووباری راین

رۆژێکە ئاسمان هەور دایپۆشیوە، خەیاڵی منیش بە خۆشەویستی داپۆشراوە. ئەم شیعرە "ئەگەر بتوانین بەمە بڵێین شیعر" هیچ نییە جگە لە ڕاژەندنی بێشکەی غەمگینی و برینەکانی ئەو ژنەی لە هەموو شت و کەس زیاتر سەرقاڵم بە بیرکردنەوە لێی.

## نووسینەوەی خەیاڵ بە فۆنتی گەورە

کەوتوومەتە ژێر شەپۆلی وشەوە
دەستم بە چڵی رستەیەکەوە گرتووە
کە هێشتا نەموتووە و
دەروونی پڕ پڕە لە ناسۆر
بە نیازی سەفەرم
بڕیام داوە بە بێ خۆم بڕۆم
خۆم لەناو فەقیانەی ئازارێکدا جێهێشتووە و
چاوەڕوانی تۆم بمکەیتەوە
من زۆر دەمێکە
بوومەتە نێچیری پەژارە
بە هەناسەبڕکێ بەسەر پردی ونبووندا دەپەڕمەوە
خۆم لە هیچ کوێ بۆ نادۆزرێتەوە
رەنگە لەناو رێگا حەلەزونییەکانی گریاندا

وون بووبم

چاوەڕێی تۆم بە چرای پێکەنین بمدۆزیتەوە

زۆر لە مێژە

ڕەشبینی وەك پیرەمێردێکی لرخن

مژ لە سیگاری تەمەنم دەدات

لە هەر چوار لاوە تەنهایی قووتی داوم

هەر دەڵێی کەوتوومەتە

دۆڵە هەزار بە هەزارییەکانی مەرگەوە

چاوەڕوانی تۆم

بە شیری مەمکی گەشبینی

گەرووی وشکم تەڕ تەڕ بکەیت و

لەناو جۆلانەی ژیاندا رامژەنی

زۆر باش دەزانم

مەرکانەی وجود

قومێك ئاوی سازگاری بۆ من تێدا نەماوە

لەم بیابانە وشکەی غەریبیدا

هەزار جار سەراب لە خشتەی بردم

کەچی ئومێدێك مێشکی داڕزاندووم

کە تۆ دێیت

تۆ لە بەرەبەیانێکی زوودا دێیت

دەستم دەگریت

بۆ ناو کەژاوەی گەواڵە هەورێک

نم نم بەسەر بەژنی نیشتماندا دەبارێین

هەمیشە ئەو پرسیارەم هەیە

بۆچی خەونەکانم وەک دڕک دەچەقنە ڕۆحم و

ئارەزووەکانم خەنجەرێکن لە دڵما؟

ئاە سەری مێژووم سپی کرد

هێشتا نەگەیشتمە هیچ وەڵامێک

هەر لە خۆڕا یەخەی دڕاوی خەیاڵ دەگرم

بە گژ شیعرە چاو تەڕەکاندا دەچم

تاکو وەڵامێکم دەست بکەوێت

بەڵام ورتەیان لێوە نایێ

ئەوسا بیرم دێتەوە

پێویستە تۆ لە دێڕی شیعرێک بێیتە دەرەوە

وەک تۆپەڵێک گڕ

لە چەمی خەندەکانتم هەڵبکێشی

سەرم لەم نهێنییە دەرناچێت

لەوەتی فامم کردووەتەوە

غەم دەڤ دڵم دەژەنێت

چۆلەکەی مەینەتیی دەندووک

لە بەرسیلەی گەنجیم دەدات

مردن بە گسکێکی رەشەوە

زوو زوو هەڕەشەی راماڵینم لیٚ دەکات

نازانم بۆچی لەم ساتانەدا

هەست بە هاتنت دەکەم؟

تا پێڵاوی حەسانەوە

بخەیتە ئەو پێیانەی

بەسەر دڕکەڵانی نائومێدیدا

رێگەیان بەرەو تۆ دەبڕی

لەوەتی لە دایك بووم

قەدەرێك هەراسانی کردووم

هەر رۆژەی دەمخاتە ژێر پێی ئازارێك

هەر شەوەی مشتێك گومان

بە دەستە پۆخەڵەکانی دەکاتە مێشکمەوە

من ئێستا مرۆڤێکی گومانکارم

مرۆڤێکم بەشی نیوەی جیهان ئازارم هەیە

بەردەوامیش بەوە سەبوری خۆم دەدەمەوە

کتوپڕ لە دەرگای ڕۆژگارم دەدەیت

منیش دڵی کڵۆمدراوم دەخەمە سەرپشت و

بۆ ئەبەد لە ژوورە تەنگەکانی خەون دێمە دەرەوە

ئایا کاتی نەهاتووە

ئیتر بێی؟

**ڕۆژی سێشەممە**

**٣-١١-٢٠٢٠**

**کاتژمێر: ١٩:١٠**

**نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس**

ئێوارەیەکی ڕەنگ پەڕیوی سەردەمی کۆرۆنا، هەموو چاویان لەسەر هەواڵەکانی پەتای کۆرۆنا و هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکایە. بە تەنیا من لە گۆشەیەکی تەزیو و تەریکی ئەم دنیا فراوانەدا بیر لە خۆشەویستی دەکەمەوە، بیر دەکەمەوە شیعرێکی تر بنووسم بکاتە دڵی ئەو ژنەی شیعرەکانمی لە خۆم زیاتر خۆش دەوێت.

# خۆناسینەوە لە ئاوێنەی ژنێکدا

من بوونەوەرێکم

لەوەتی لە دایکبووم

ڕۆحم بە پشکۆی غوربەت چزاوە

لەوەتی فامم کردۆتەوە

دڵۆپ دڵۆپ غەمگینی

دەچۆڕێتە بیرکردنەوەمەوە

لە موسافیرێک دەچم

هەزار ساڵە ڕێ دەبڕێت

ناگاتە هیچ کوێ

جگە لە ڕێگە بنبەستەکانی تەنهایی

جگە لە کۆڵانە تەماوییەکانی وەهم

جگە لە ئامێزی برینگی سەراب

شێوەم لە شێوەی درەختێك دەچێت

لە مەوسومی پایزدا

هەمیشە بلوێری وەرین دەژەنێت و

دەموچاوی خۆی دەڕنێتەوە

لە وەرگێڕێك دەچم

تەرجەمەی ئازار دەکات

بۆ سەر زمانی شیعر

نیگا کپ و بێدەنگەکان

وەردەگێڕێت بۆ سەر زمانی هاوار

لە کتێبێکی زۆر کۆن دەچم

ژنێك بە نهێنی دەمخوێنێتەوە

بە ئەسپایی پەڕە پەڕە هەڵم دەداتەوە

نەکا لە ژێر پەنجەکانیدا بوەرێم

لە ئۆکۆردیۆنێکی رزیو دەچم

هیچ مۆسیقارێك دەنگی نوساوی

پێ ناکرێتە میلۆدییەك

بۆ دڵخۆشیی ئەو ئارەزووە تەڕانەی

تازە کەوتوونەتە دارەدارە

بۆ حوزنی ئەو مەزرا مەلولانەی

مینا خونچەیەك دەمیان

بۆ چۆڕێك باران کردۆتەوە

لەگەڵ ئەوەشدا

من تا ئێستا تێناگەم

بۆچی هێندە نزیکم لە تەبیعەتی ئاو؟

بەلای هەر مەزرایەکی وشکدا تێپەڕم

دەخوسێت!

بەسەر هەر بیابانێکی قاقڕدا ڕێ بکەم

ئەبێتە گوڵشەنێکی ئەبەدیی

بەناو هەر دۆڵێکی خنکاودا ڕەت بم

ئەبێتە مێرگ!

لەوە تێناگەم

بۆچی هەمیشە بە دڵێکی تەنگەوە

شیعر دەنووسم

سەرئەنجام کانی وشکبووی

ڕۆحی ژنێك دەژێنێتەوە؟

حەیرانێك لە قەبرێکی دێرین

دەهێنێتە دەرەوە و

لەسەر لەشی پیرە دنیا

دەکەوێتە سەما؟!

مەراقمە بگەمە حیکمەتی ئەوەی

بۆچی لە باوەشی پێکەنیندا

جێم نابێتەوە

کەچی دەتوانم لە دڵۆپێك فرمێسکدا

بە ئاسانی قاچ رابکێشم؟!

لەگەڵ ئەوەشدا

نامەکانم بۆ ژنێك

کوپەیەکی پڕ گەشبینی و

جۆگەیەکی تەژی لە خەندەن!!

زۆر لە خۆم تێناگەم

هەر ئەوەندە لە خۆم حاڵی بووم

فووم لە چرای عەقڵ کرد و

شوعلەی هەست هەڵیکڕوزاندم

ئەوەندەی بە بیرم دێتەوە

ڕێگەی چۆڵەوانیم دەبڕی

هەر خۆم و گۆرانییە تەنهاکانم

هەر خۆم و شیعرە کەساسەکانم

هەر خۆم و خۆم بووین

لە ناکاو ژنێك پەلی ڕاکێشام

بۆ نێو لالەزاری خەونەکانی

لەو ڕۆژەوە زۆر گۆڕام

ڕابردووم هیچ بیر نایەتەوە

لە ناو ئەو ئێستایەدا دەژیم

کە بەیانیان لە خەو هەڵدەستم

بە واق وڕماوییی

بە عەشق دەڵێم باپیرە و

شیعریش بە داپیرە بانگ دەکەم

لە ئاوێنەی دڵی ئەو ژنەدا

بە ئەبڵەقی لە خۆم دەڕوانم

هێواش هێواش خۆم دەناسمەوە

لە جێگەیەکم دەستی خەیاڵیشم

نەیگەیشتووتێ

ئاە ئەوە منی ڕاستەقینەم

لە ناو چ عەشقێکدا گەوزاوم؟

ئای خۆ ئەوە خۆمم

تازەترین مەجنونم

لەبەر دەرگای ماڵی لەیلام

٢١-١١-٢٠٢٠

ڕۆژی شەممە

کاتژمێر: ١٣:٣٠

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

ئەمڕۆ ڕۆژێکە لەناو خۆمدام، بە قووڵی لەناو خۆمدام، وزەی ناوکی خۆم خستووەتە گەڕ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو نەشتەرگەرییە سامناک و پڕ ریسکەی وا بڕیارە لەم چەند ڕۆژەدا بۆ مێشکم بکرێت. ئومێدم هەیە ڕزگارم ببێت، وەلێ شانسی سەرکەوتن زۆر کەمە، ناخوازم بڵێم ئەمە دوا شیعری منە لە ژیاندا، بەڵکو ڕەنگە دوا شیعری پێش نەشتەرگەریی بێت، کە نازانم چەندی دەوێت لە دوای نەشتەرگەریی تاکو دەتوانم بنووسمەوە، بەپێی ئەزموونی پێشووم شەش مانگێك لەکار و بیرکردنەوە و نووسینم دەخات. هەرچۆنێك بێت تەزیویی ئەم ڕۆژە ساردەی باکووری زەویم بەم شیعرە گەرم کردەوە.

## ستیانی ژیان پڕە لە تۆوی مردن

مەرگ بە دوامەوەیە
لە ژووره نسرمەکانی نەخۆشخانە
بە وردی چاوم بۆ دەگێڕێت
بیٚ ئاگا لەوەی
لە دێڕێك شیعردا
خۆم حەشار داوە
کە بۆنی باخێکی گریاوی لیٚدیٚ
ژیانیش وەك بەڵغەمێك وایە لە قورگما
نە دەتوانم قووتی بدەمەوە
نە دەتوانم لەمە زیاتر رایگرم
رەنگە زۆر زوو بیتفمەوە
****

ئاه

چ زستانێکی شەختەیە
چاوم چلورەی پێدا شۆڕ بووەتەوە
هەموو شتێك بەستوویەتی
چەمی فرمێسکم بووە بە سەهۆڵ
ژیان لەماڵی خۆی دەرم دەکات
مەرگ میهرەبانترە و
باوەشم بۆ دەکاتەوە

****

ئەریٚ بێزار نەبووین
لەو هەموو شەڕەی بۆ ژیان دەیکەین؟
ئەویش لە کۆتاییدا
هەروەك ناپاکێك
هەمووان لەسەر سفرەی مەرگ
کۆ دەکاتەوە

****

گیرفانی ژیان بپشکنن
پڕیەتی لە نامەی دڵداریی
نێوان خۆی و مردن
ئاخر دەمێکە

ژیان بووەتە قاچاخچی
بە تاك و كۆ
پەلمان دەگرێت
ڕووەو مەرزەكانی مەرگ
****
من برا گەورەی خەم و
كوڕی بچووكی ئازارم
ڕەشبینی برای گچكە و
دڵتەنگی خوشكە قەیرەكەمە
غەریبی دایكمە و
تێر لە شیری مەمكەكانیم خواردووەتەوە
مەرگیش دوا هاوڕێ
كە لە دوماهیدا بیناسم
****
چیدی حەواسم نەما
بە خاتری چەپڵە درۆینەكان
مەرگ بدەم بە زەویدا
ئەو هێشتا گەمەی دەست پێنەكردووە
كێ بەرگەی زللەیەكی مەرگ دەگرێت
تا من بیگرم؟؟

ببورە ئەی مەرگ

من زۆرانبازیت لەگەڵ ناکەم

نا،نا، تا بۆم بکرێت

خۆمت لێ دەشارمەوە

****

ژیان پەرتوکێکە

پەڕە پەڕە دەیخوێنینەوە

بەو ئامانجەی بگەینە

هەنگوینی تێگەیشتن لێی

وەلێ ئەفسوس

مەرگ کەمینی داناوە

لەناکاو لە پشتی دێڕێکەوە

پەلامارمان دەدات و

ئیدی هەموو شت تەواو

****

١٠-١٠-٢٠٢٠

١١-١١-٢٠٢٠

فڕکان فڕکانی نێوان نەخۆشخانەکانی

وڵاتی هەمیشە پاییز

# سەدەی ئافات

خەونەکانم چڕنوکم لێ دەگرن
بە نینۆکیان دەموچاوی ئارامیم دەڕوشێنن
بە قامکیان پرچی ئارەزووەکانم دەئاڵۆزکێنن
دەستم دەگرن بۆ گەڕەکەکانی شێتی
سواری گالیسکەی گاڵتەجاڕییم دەکەن
کۆڵان بە کۆڵانی شار دەمگێڕن
سەدان جار گورگانخواردیان کردووم و
بەردەوام دەمدەنە بەر دەستڕێژی جنێو
نازانم دڵی کام پاساریم شکاندووە
وا ژیان بە قامچی دڵڕەقیی سزام دەدا؟
خۆ من توند مەمکی هێشووە ترێم دەگوشی
مەیخانەیەکی کاولبووم

ئاوەدان دەکردەوە
بۆچی ئەبێت بە خاچی زستانەوە
تا رەقبوونەوە هەڵبواسرێم؟
خۆ من تفم لە نیشتمان نەدەکرد
ئەو هەموو بەڵفەمی سەرزەنشتە
ئاڕاستەی نێوچەوانم دەکرێت
من دەمەویست میز بکەم
بەسەر ئەو کولتوورەدا
لوقمی خۆشنوودی ناخاتە
زاری قەلەندرێکی مەحزونەوە
یان دەست دەکات
بە رنینەوەی گوڵە تازە شکۆفەکردووەکان و
پەرەمێز تاوانبار دەکات
ئیدی بۆچی ئەم تەرزەی نەفرەتە
لە ئاسمان رەش هەڵگەڕاوی منا
هیچ کات خۆش ناکاتەوە؟
خۆ من نیازم وا بوو
چیرۆکی ئەو بەلەمانە بۆ "ئیجە" باس بکەم
بیٚ ئەوەی لە سیڤی سەرنشینەکان بکۆڵێتەوە
شەپۆل مینا ئیزرائیل دەنێرێتە گیانیان

هەر زۆر زوو وەك بێگانەیەك
بە دەم رشانەوە هەڵیاندەهێنێتەوە
ئیدی بۆچی غەم قۆڵ بە قۆڵمدا دەكا
بە قژ راكێشان تا دەربەندی فرمێسك دەمبا؟
خۆ من تەماعم لە ژیاندا ئەوەندە بوو
بەشی سەرخەوشكاندنێك
لەسەر رانی نەرمی نیشتمان
لەززەت ببەم
بۆچی ئەم حەزە ساكارەم
لەگەڵ لە دایكبوونیدا كفنی غوربەتی
بە بەردا دوورا؟
هەر ئەوەندەم لە دنیا دەویست
مرۆڤ نەبێتە حەشاماتی كەلاك و
لە تابووتی ژیاندا بۆگەن نەكات
ئیدی بۆچی مەلی گەشبینیم
لە شەقەی باڵی دا و
ساتێ دێتەوە من لەوێ نیم؟
ئەبێ لە كوێ بم؟
ئەو كاتەی گەشبینی دێتەوە
رۆحی زامدارە

هەناوی پڕ ناسۆرە

بە هەناسەبڕکێ و بە دارشەقی پەژارە

ڕێ دەبڕێت

لە پەستیدا پێشوازیی لێ ناکەم

ئاخر لە دوای ڕۆشتنی ئەو

هەموو ڕۆژێك دەمی ئێواران

لەگەڵ نائومێدیدا لە ژواندام

من هیچم لە جیهاندا نەدەویست

خەونی من لەم جیهانە گەورەترە

ئەشکەوتی خەیاڵم هێندە قەرەباڵغە

جمەی دێت

لەو ڕستانەی هێشتا فەرهەنگ نەیبیستوون

لەو وشانەی هێشتا دەرنەبڕدراون

لەو ئەنگێزانەی بە مێشکی کەسدا گوزەریان نەکردووە

هەموو ئەمانەش

لە پێناوی نووسینەوەی شیعرێکی تەڕ

بۆ ژنێك کە خەریکە دڵی وشك دەبێتەوە

ئیدی بۆچی ئەم ڕێگایە

بۆ من بوو بە بنبەست؟

ئەوەتا ئێستا دەستەوئەژنۆ

بەدیار تەنهایی خۆمەوە ئێشکم گرتووە
شیعرم دەگرییَ و دەگریێ
هەرگیز ژێر نابێتەوە

٢٠١٥-٩-٧
نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس
ئەڵمانیا - بیلەفێڵد

تێبینی: ئەم شیعرە دوای دوو ڕووداو کە ناخی منیان هەژاند نووسراوە. یەکەمیان خنکانی منداڵێکی کورد بەناوی "ئایلان کوردی" لە دەریای ئیجە، کە دواتر کاردانەوەیەکی گەورەی لەسەر ئاستی جیهان لێکەوتەوە. دووەمیان ڕووداوی کوشتنی دوو کچ لەو هەفتەیەدا، کە تاوانەکەی خرایە ئەستۆی پەرەمێزی بەستەزمان. "ئەگەر چی نەمەویست سیحری شیعرەکە بەتاڵ بکەمەوە، بەڵام وا پێویستی دەکرد، پیَ لە جەرگی خۆم بنێم و ئەم دێڕانە بنووسم"، ئەو ڕۆژانە دەروونم وەك شەپۆلی دەریا هەڵدەکشا و ئۆقرەی نەمابوو، بەتایبەت ئەوە شەشەم ڕۆژم بوو لە داخڵبوون لەو نەخۆشخانەیەی دەیان شیعری ترم تێدا نووسی و تا ئێستاشماڵی دووەمی منە، پاش ئەوەی لە مانگی ئۆگەستی ٢٠١٥ بە تەواوەتی کەیسی من لە ئونی کلینیکی شاری کۆیلنەوە گواسترایەوە بۆ نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس لە شاری بیلەفێڵد.

٢٠٢٠-١١-٢٢

# ئەو وڕێنانەی هەرگیز نابنە شیعر

شیعرێك لە زینداندا نووسرابێت

بێگومان باسی ئازادیی دەكات

ئەی ئەگەر عاشقێك شیعر بنووسێ؟

****

بە چوار بزماری پاییزیی

تابلۆی بەهاریان هەڵواسی

تك تك

خوێنی سۆسەن دادەچۆڕا

****

ژیان دووبارەبوونەوەیەكی بێ مانایە

مەرگ تاكە ڕووداوە لە دەرەوە دێت و

ئەو بێ ماناییە ڕادەگرێ

****

شیعر وسڵی لەشپیسی خۆی دەرکرد

لەو هەموو درۆیەی

بەدرێژایی تەمەن کردوونی

****

تووڕەییم دەبارێت

هەر دەبارێت و

دەبارێت

خۆش ناکاتەوە

تا ژیان پەنجەی ئاشتبوونەوە

نەخاتە پەنجە تووتەمەوە

****

مێشکم کرمێ بووە

خەونم کەڕووی هەڵهێنا

دڵم ژەنگ لێی داوە

ڕۆحم بە شەوارە کەوتووە

بەدەست ژاوەژاوی

مرۆڤی مودێرنەوە!

****

ئیشی سەرەکی سەرکردەکان ئەمەیە:

دینامیت دەخەنە

ژێر پێی خەیاڵەکانمان

قافڵەی خەونەکانمان

تالآن دەکەن

وەزیفە بۆ دەستەکانمان ناهێڵنەوە

جگە لە چەپڵەلێدان

****

لە مێگەلی زیندووان دەپرسم

ئەو سەرە زلانەتان بۆچییە

کە توانای خەون بینینتان نییە؟؟!!

****

خەونێکی لەبارچووم

هەر لە ڕەحمی دایکما خنکێنرام

کەس نەیبینیم و

کەس کەسیش پرسەی بۆ دانەنام

****

مالێکم هەیە بێ دەرگا

هەرچی ئافاتە ڕووی تێدەکا

تەنیا جارێکیش

چۆلەکەی خۆشبەختی

تێیدا نەکەوتە جریوە جریو

****

لەسەر سیسەمی ئازار

لە باوەشی شێتیدا دەنووم

هەرچی بەلامدا تێدەپەڕێت

بە وشە شەبەقی برینەکانم

گەورەتر دەکا و

بە شێتییەکانم تێر تێر

پێدەکەنێت

****

بە گریانەوە لە دایك بووم

بە فرمێسکەوە تەمەنم بەڕێکرد

بە غەمگینی عاشق بووم

ئایا مافی ئەوەم نییە

بەختەوەرانە بمرم؟

****

من ئەڕۆم

ماچەکانم بە لێوتەوە وشك دەبنەوە

نوێژەکانم

لەسەر بەرماڵەکەت دەوەرێن

هەوڵبدە ئەسرین نەڕژێ

چونکە ڕووناکترین یادەوەرییەکانم

لای تۆ جێهێشتووە

****

گەڵایەکی وەریوم

هێواش هەنگاو بنێ

هێمنتر بەم باخە پایزییەدا تێپەڕە

گوێت لە خرمە خرمی ئێسکەکانم نییە

لە بن پێڵاوی غرورتا؟

****

گۆڕ هەڵدەکەنم

بۆ ئەو شەوانەی تەنهایی

خۆی خزاندبووە خەیاڵمەوە

بۆ ئەو ڕۆژانەی خەفەت

وەك کلوە بەفر دەبارییە

نێو ڕۆژژمێرە گرینۆکەکەمەوە

بەلآم بەو مەرجەی
چیتر لەسەر کورسی چاوەڕوانی
نەمهێڵیتەوە
****

بەسەر پلیکانەی ژیاندا سەردەکەوتم
شادییم لەسەر هیچ پلیکانەیەك نەبینی
بۆ دۆزینەوەی بەختی خۆم
پلیکانە بە پلیکانە سەرکەوتم
لەناکاو مەرگ پاڵێکی پێوە نام و
بەر بوومەوە!
ئەمە هەموو سوڕی ژیانی من بوو
****

سواری ئەسپی خەیاڵێکی شەل بووم
بە دوای خۆمدا ئەگەڕێم
لە دوورگە تەڕەکانی خۆشەویستی
لە بنارە دڵڕفێنەکانی خۆشنودی
لە دەشتە رووخۆشەکانی ئارەزوو
نا من لەوێ نیم
لە شیوە بۆگەنەکانی نائومێدیدام
ئایا شیوەکانی پوچی لە مندا نین؟
****

وردوخاش بووم
کە منت لەنێو تەمی یادەوەرییەکاندا
بۆ هەمیشە جێهێشت و
بە تاڵێك لە پرچی خۆت
خەونەکانت لە سێدارە دام
ئەمێستا بەدڵە خورپەوە دەڵێم
وەك بێبەشت کردم
لە سەرخەوشکاندنێك لەسەر سینگت
هیچ نەبێت خەونەکانم بدەرەوە
****
ئەمەوێت شیعرێك بنووسم
بە ڕیشی تازە سپی بوومەوە
تەق تەق لە دەرگای منداڵیم بدا
لەوێ لە ماڵی منداڵیی
دەست بکەمەوە بە خەون بینین و
بە میکانۆکانم جیهانێك بە دڵی خۆم
دروست بکەمەوە
****

زەمەن لەسەرم ڕاناوەستیٚ

ئاخر تاوانی من چییە

ژیان مۆڕەم لیٚ دەکات و

مردن چاوم لیٚ دائەگریٚت؟

ئاواتم ئەوە بوو

پیٚش ڕژانی شەربەتی تەمەن

ژنیٚك وەك قاوەیەكی تاڵ

قوم قوم بمخواتەوە

****

نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

ناوەڕاستی مارس

کۆتایی ئۆکتۆبەر

ساڵی دوو هەزار و بیست

چیتر مێژووی ئاو
تەڕایی لێ ناچۆڕێت
چیدی ئەستێرە سەرخۆشەکان
بە شەقامی ئاسماندا پیاسە ناکەن
باخەکان لێوی زەردهەڵگەڕاویان
بە لێوی هەوەسی چۆمەکانەوە نانێن
مرۆڤەکان یەکتر ناناسنەوە
مەگەر بە بۆنی یەئسەکانیان
ئەو ڕۆژە پرتەقاڵییانەی چاوەڕوانیان بووین
ببنە عەمباری پێکەنین
یەک یەک بە سێدارەی ئافاتەوە هەڵواسران
ئەو ژوانانەی دەبوو
دەرگا لە چێژ بکەنەوە و
سەربردەی ماچە مەکراوییەکان بنووسنەوە
تۆفانی زەمەنێکی دڵڕەق لوولیدان